# گەشەکردنی زمانی منداڵ


وەرگێڕان:

پ. ی. د. ئازاد ئەمین باخەوان

و

ناصح محمد فاتح



کەرکوك - ٢٠١١







ناوی کتێب: گەشەکردنی زمانی منداڵ

بابەت: زمانی منداڵ

وەرگێڕانی: پ. ی. د. ئازاد ئەمین باخەوان – ناصح محمد فاتح

تایپ: بورهان کەریم

دەرهێنانی هونەری: ئەنجام سەعید

لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد– لقی کەرکووك ژمارە (١٢٠)

چاپخانە: کارۆ

چاپی یەکەم– ٢٠١١

تیراژ: (٥٠٠)دانە

**به ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

## پێشەکی

زمان و زمانناسیی دوو بابەتن لە بابەتەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان. لە زمانە جیاجیاکانی جیهاندا گەلێك کتێب و لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. بەڵام لە زمانی کوردیدا زۆر بەکەمی لەم بوارەدا لێکۆڵینەوە و وەرگێڕان و نووسین دەبینرێت.

کتێبی (گەشەکردنی زمانی منداڵ) بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوە و کاتێك ئەم کتێبە کەوتە بەر دەستمان و خوێندمانەوە بەکارێکی زۆر نایابمان زانی و بۆیە سەرەتا دەستمان کرد بە وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی چەند بەشێکی لە چەند گۆڤارێکدا. پاشان وامان بەچاك زانی کە هەموو کتێبەکە لە توێی یەك بەرگدا وەرگێڕینە سەر کوردی و بڵاوی بکەینەوە. بەهیوای پڕکردنەوەی کەلێنێکی زۆر بچووك لە کەلێنەکانی کتێبخانەی کوردی و سوود گەیاندن بە دایکان و باوکان و قوتابیان بە گشتیی و مامۆستایانی زمانەکان بە شێوەیەکی تایبەتی.



هیوادارین توانیبێتمان خزمەتێکی بچووکی زمان و نەتەوەکەمان کردبێت. هەروەها داوای لێبووردنیش لە خوێنەری بەڕێز دەکەین سەبارەت بەکەم و کورپییەکانی وەرگێڕان و چاپکردن و هەڵەی هونەریی، چونکە ئێمەش هەر ئەوەندەمان لە دەست دێت و پاکی و بێگەردی و توانای پەتیی هەر هی خوای باڵا دەستە.

**هەردوو وەرگێڕ**

## به ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

## پێشەکی دانەر

زانستە مرۆڤایەتییەکانی سەدەی بیستەم هەنگاوی خێراو پێشکەوتوییان ناکە بوو بەهۆی سەرنج و بایەخ پێدانی زانایان و لێکۆڵەرەوان و ئەوەش لەپێناو تێرکردنی ئارەزووە بەهێزەکەی مرۆڤ هاتووە بۆ تێگەیشتن لە خۆی و ئەو دەوروبەرەی کە تیایدا دەژێت و هەروەها بۆ تێرکردنی ئەو زانخوازییەی (حب الاستطلاع) کە لە گیاندارانی دیکەی جیا دەکاتەوە.

مەبەست لە زانستە مرۆڤایەتییەکان ئەو زانستەیە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەژیانی مرۆڤەوە هەیە، جا چ لە نزیکەوە یاخود لە دوورەوە بێت. زمانیش یەکێکە لەو بابەتە مرۆڤایەتییانەی کە دەستی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی پێگەیشتووە و سەرنجی مرۆڤی ڕاکێشاوە. زانخوازی هانی داوە بۆ دەستکەوتنی زانیاریی بۆیە دەستی کردووە بە لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە لە زمان و هەوڵێکی بێوچانی داوە بۆ دەرخستنی هەر شتێك کە



پەیوەندی پێوە هەبێت.

بێگومان زمان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە ژیانی مرۆڤدا، زمان ئامرازی پەیوەندی کۆمەڵایەتیی و زمانی گفتوگۆکردنە لەنێوان خەڵکیدا. هەر بەهۆی زمانەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت هەست و نەستی دەربڕێت. ئا لێرەوە زاناکان باسکیان لێهەڵماڵیوە بۆ لێکۆڵینەوەی لایەنەکانی زمان، وەکو ڕوخسار و میکانیزمی قسەکردن و گەشەکردنی زمان و توانای گۆکردن و هەرشتێکی دیکەش کە پەیوەندی بە زمانەوە هەبێت

هیچ گومان لەوەدا نییە کە لێکۆڵینەوەو بەدوادا چوونی زمان لەوپەڕی کرانیدایە. ئا ئەمە وا دەکات لە لێکۆڵەری ئەم بابەتە کە بگەڕێتەوە سەر ئە و زانیاریانەی کە زانایانی زمان و دەروونناسان و لێکۆڵەرەوان پێی گەیشتوون بۆ سوود وەرگرتن لە لێکۆڵینەوە و ئەنجامەکانیان.

چاوەڕوان دەکرێت لە لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبەدا لێکۆڵەر هەندێك شارەزای ئامانجەکانی پلانی وەزارەتی فێرکردنی باڵای ئوردن بێت.

١- زانینی قۆناغەکانی گەشەکردنی زمانی منداڵ.

٢- بەراورد کردنی زمانی منداڵی ئاسایی لەگەڵ منداڵی نائاسایی.

٣- دەستنیشانکردنی هۆکارە کاریگەرەکانی سەر گەشەکردنی زمانی منداڵ.

٤- زانینی پەیوەندی نێوان هزر و زمان

٥- زانینی رێگاکانی پەرەپێدانی واتا لای منداڵ.

٦- بەهێزکردنی توانای منداڵ بۆ فێربوونی زمان.

٧- هەڵسەنگاندنی گرنگیی زمان لە جیهانی نوێدا.

٨- زانینی گاریگەری چەند زمانێك لەسەر منداڵ.

بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە ئەم کتێبە حەوت یەکە دەگرێتە خۆی. یەکەمیان پێشەکیەکە دەربارەی زمان، کە تیایدا پێناسەو گرنگیو ئەرکی زمان باس کراوە. یەکەی دووەمیش باسی تیۆرەکانی فێربوونی زمان دەکات. یەکەی سێیەمیش باسی لایەنی فسییۆلوزی زمان دەکات. یەکەی چوارەمیش باسی گەشەکردنی زمانی منداڵە. یەکەی پێنجەم لاسی زمان و هزلروو واتا دەکات. یەکی شەشەم باسی دەست نیشانکردنی ئادای زمانیی دەکات. یەکەی حەوتەمیش خەوشەکانی(عیوب)ی قسەکردن و زمان دەگرلاێتە خۆی.

ئەمەو لە کاتێکدا کە ئێمە ئەم کتێبە دەخەینە بەر دەستی قوتابیانی گۆمەڵگەکەمان و مامۆستایان و هەموو ئەوانەی کە تەماشای دەکەن،لە خودای گەورە داواکارین



توانیبێتمان بەم ئیشە بچووکە حەقی ئەم بابەتەمان لە گرنگیی پێدان و ئەو ماندوو بوونەی کە شایانێتی ئادا کردبێت. هەروەها هیوادارین کارەکەمان لێقبووڵ کرابێت و لە هەموو لایەك داوکارین سەرنج و بیرو بۆچوون و پێشنیاروو رێنماییەکانیان بنێرن بۆمان تا ببنە یارمەتی دەرمان بۆ پڕ کردنەوەی کەمو کوڕیەکان و خۆ دوورخستنەوە لە زەللەی زمان و و ئاگادار بونەوە و داوا کردن و چاك کردنوەی هەر شتێك کە لە کاتی باس کردنی ئەم کارە بە دەستمان نەکەوتبێت.

خوای گەورە یارمەتی دەرمان بێت.

دانەر

**عبدالکریم محمد شطناوي**

**حوارة- اربد ١٩٩٢**

## یەکەی یەکەم





## سەرەتایەك دەربارەی زمان

زانایانی ژیربێژی مرۆڤ وا پێناسە دەکەن کە گیانلەبەرێکی قسەکەرە مەبەستیانیش لەمەدا ئەوەیە کە مروڤ بۆ لەیەکتر گەیشتن لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیدا دەتوانێت زمان بەکار بهێنێت، واتا زمانی دەنگیی کە بریتییە لە بڕگەو وشەو ڕستە، کەواتە زمان دیاردەیەکی مرۆڤایەتی کۆمەڵایەتییە هەروەها لە ڕێگەی زمانەوە روخساری جیاکەرەوەی هەموو کۆمەڵگایەك لە هەموو چاخێك لە چاخەکانی مێژوودا دەناسرێتەوە.

زمان لە هەردوو شێوەکەیدا واتە دەربڕاوو نووسراو ئامێرێکی سەر سوڕهێنەرە، لە ڕێگای زمانەوە ئەو شتانەی کە دەکەونە نێو هەستەکانمانەوە، دەگوێزرێنەوە بۆ مێشك هەروەها ئەو شتانەی کە لەم دونیایەدا هەنە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەگەنە مێشك، ئەم گەیشتنەش بە ڕێگای نووسین و قسەکردن ئەنجام دەدرێت، هەموو ئەو شتانەی کە لە مێشکدا خول دەخۆنەوە، وەکو بیری ڕاگوزاری و هەست و هزر بۆ کەسانی دی دەگوێزرێتەوە هەروەها لە چەرخێکەوە بۆ

چەرخێك و لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی تر دەگوێزرێتەوە، زمان وەکو پردێك وایە لە نێوان ژیان و بیر، زمان ڕەگەزێکی سەرەکییە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا.

زمان تەنها ئامێری گواستنەوەو تۆمارکردن نییە بۆ ژیان و بیر، بەڵکو هەروەکو هەموو ڕەمزەکانی دیکە یارمەتیی گەشەکردنی بیرو خۆش گوزەرانی خەڵکی دەدات، زمان وەکو هۆکارێك وایە بۆ گەشەپێدانی بیرو پاڵپێوەنانی بەرەو باشتر، ئایا ئەو وشەو دەربڕینە گشتیانەی کە بەکاری دەهێنین وەکو: وشەی دارو مرۆڤ و باڵندە لە ڕەمزە بیرکارییەکان (الرموز الریاضیة) ناچن؟! ئەو ڕەمزانە لەو پارەیە ناچن کە بە ڕەمزێ دادەنرێت بۆ بەهای شت؟! زمان تەنها هۆی دەربڕین نییە بەڵکو لە هەمان کاتدا ئامێری گەشەکردن و بۆ پێشەوەچوونی بیرە، لێکۆڵەرانی زمان لە هەموو بابەتێکی دیکە زیاتر بایەخیان بە فێربوونی زمانی منداڵ داوە، ئەویش لەبەر ئاڵۆزی زمان لەلایەکەوەو ئاسانی و خێرایی فێربوونی منداڵ لەلایەکی دیکەوە، سەرەڕای ئەوەی کە زمان ڕۆڵێکی کاریگەر لە ژیاندا دەبینێت کە چی لەسەری ڕاهاتووین هەروەکو هەناسەدان و ڕێکردن.



## پێناسەی زمان

زمانناسان بەگەلێك شێوە پێناسەی زمانی هاوچەرخ (زمان)یان کردووە، هەندێکیان بەلای ئەوەدا دەچن کە زمان تەنها بریتی بێت لە ڕەمزی دەربڕین و هەموو ئامرازەکانی دەربڕین و پێوەندی کردنی دیکەی نادەنگیی وەکو جوڵەو هێماو ئیشارەت کردن و نووسین و شتی دیکەش لە زمان جیا دەکەنەوە، ئەوا (جۆن کارۆڵ)یش زمان وا پێناس دەکات کە سیستەمێکی پێکهاتووە لەو دەنگانەی کە خەڵکی لەسەری ڕێکەوتوون، ئەو دەنگە یەك لە دوای یەکانەش کە بەکار دەهێنرێت یان دەتوانرێت بۆ پێوەندی کردن لە نێوان کۆمەڵێك کەسدا بەکار بهێنرێن،دەشێت بەشێوەیەکی گشتی شت و رووداوو کردار لە ژینگەی مرۆڤایەتیدا پۆلین بکەن، باشتر وایە هەندێك جار مانای زمان فراوانتر بکرێتەوە بۆ ئەوەی ئامرازەکانی پێوەندکاریی گۆنەکراو (غیر لفظي) بگرێتە خۆی وەکو ئەو دەربڕینانەی کە لە ڕەنگ و روخساری مرۆڤدا دەردەکەوێت، واتا ئەو دەربڕینانەی کە بەشداری ڕەفتاری ئاخاوتن دەکەن.

بۆ پێناسەکردنی زمان ژمارەیەکی زۆر پێناسە هەیە

بەڵام ئێمە هەندێك لەم پێناسانە بۆ نموونە دەهێنینەوە. (هۆمبۆڵت)ی ئەڵمانی سەبارەت بە زمان دەڵێت: زمان ڕشتەیەكی ئەندامییە (جهاز عضوي) كە پێویستە لەسەر ئەم بناغەیە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت، زمان بە پێی ئەم پێناسەیە سیستەمێكی ئەندامیو بناغەییو وێنەیەكی ناوەكییەو،پێچەوانەی وێنەی دەرەكی ئاخاوتنە، ئەو زانایە وای بۆ دەچێت كە زمان ئەو ئەندامەیە كە دەبێتە هۆی داڕشتنی هزر، وا دەبینین ئەو چالاكییەی كە هزر دروستی دەكات هەمان چالاكییە كە زمان دروستی دەكات.

دەروونناسەكانیش زمان وا پێناسە دەكەن كە ئامێرێكە بە هۆیەوە دەتوانرێت هەر وێنەیەك یاخود بیرێك شیتەڵ بكرێت بۆ بەشو خەسڵەتەكانی كە دەشێ جارێكی دیكە ئەم وێنانە لە مێشكی ئێمەو مێشكی خەڵكی دیكەدا پێك بهێنرێنەوە ئەویش بە هۆی پێكەوەنانی وشەو دانانی ئەو وشانە بە ڕێكخستنێكی تایبەتی واتا (دروستكردنی ڕستە).

زانای ئەمەریكیش (ولیەم ویتنی) لە پێناسەكردنی زماندا دەڵێت: زمان نە هێزێكە لە هێزەكانی دەروون، نەكاری بیری ڕاستەوخۆیە، بەڵكو شوێنەوارێكی ناڕاستەوخۆی ئەو بیرەیە، بەلای ئەم زاناوە زمان



ئامێرێكەو ئەو ئامێرەش تەنها لە دەنگی بڕگەدا خۆی نابینێتەوە، چونكە ئەو ڕەگەزە بنەڕەتییەی زمان لە هەندێك ڕووەوە مادییەو لە هەندێك ڕووی دیكەوە فیزیكییە، چونكە ئەو دەنگە دەلیلە بۆ مانایەك لە ماناكانی هزر، زمان سیستەمێكە لە كۆمەڵێك دەنگی خاوەن ناوەڕۆكی پەسەند، ئەمیش لە ئەو تەنانە (أجسام) دەچێت كە پارچەكانیان ڕێكو پێكەو خاوەنی بناغەیەكی دیاریكراون.

ئینسایكلۆپیدیای فەرەنسیش زمان وا پێناسە دەكات كە بریتییە لە چەند نیشانەیەكی لێكدراو كە هەستی جیاواز لە هۆشدا دروست دەكات ئینجا ئەم نیشانانە یان ڕاستەوخۆ دەوروژێندرێن یان لە ڕێگەی پەیوەست كردنەوە دەخەملێندرێن، لەم پێناسەدا هیچ ئاماژەیەك نەكراوە بۆ ئاخاوتنو بەهای دەنگیی بەڵكو لەسەر بناغەی ئەو نیشانە ڕەمزیانەی كە لەسەری ڕێكەوتوون دەقاودەق ئەم پێناسەیە باسی سروشتی پێكهاتەی زمان دەكات، ئەم نیشانانە لە شێوەی پێكهاتە پێكەوە جۆش دەدرێن، مەبەستی ئەم جۆشدانەش بۆ وروژاندنی چەند هەستێكی دیاریكراوە، ئەمەش مانای تێڕوانینێكی فراوانە بۆ زمان، چونكە زمانی ئاخاوتنو زمانی نیشانە بینراوەكان

(الاشارات المرئية) دەگرێتەوە.

(جۆن دیوی) زمان بەو جۆرە پێناسە دەكات كە ئامرازی پێوەندیی كردنە لە نێوان تاكەكانی كۆمەڵ‌و یەكخستنیان، بێگومان لە پێناسەكەی (دیوی)ی فەیلەسوفی سودبەخشی (الفلسفه النفعیه) تێبینی بەهای سودبەخشیی زمان دەكرێت كە ئەوپەڕی بایەخی پێ دەدرێت.

(مۆریس) زمان وا پێناسە دەكات كە بریتییە لە كۆمەڵێك پێوەندی خاوەن واتای هاوبەش كە هەموو ئەندامەكانی كۆمەڵ دەتوانن پێی بدوێن، هەروەها زمان شێوەیەكی جێگیری ڕێژەیی هەیە لەهەر هەڵوێستێكدا كە دەربكەوێت سیستەمێكی سنورداری دەبێت‌و بە پێی ئەو سیستەمە بناغەیەكی دیاریكراوی دەبێت ئەویش لە پێناو دروستكردنی نیشانەی ئاڵۆزتر.

بەڵام (ماكس مولەر) وا پێناسەی زمان دەكات كە زمان هێمای دەنگیی بڕگەدارەو بە هۆیەوە دەتوانین بیرو باوەڕی خۆمانی پێ دەربڕین، ئەم پێناسەیەش زۆرتر لە بواری سایكۆلۆژی زماندا بەكاردێت.

كە چی دكتۆر (ابراهیم أنیس) زمان بەوە پێناسە دەكات كە سیستەمێكی عادەتییە بۆ هێمای دەنگیی كە مرۆڤ بەكاری دەهێنێت بۆ پێوەندی كردن لەگەڵ یەكتردا.



## بایەخی زمان

خوای گەورە نیعمەتێكی گەورەی بە ئادەمیزاد بەخشیوەو لە هەموو گیاندارانی دیكەی جودا كردووەتەوە بەوەی كە زمانی پێ داوەو توانای ئەوەی پێ بەخشیوە بە ڕێگای ڕشتەی دەربڕین‌و قسەكردنەوە پێوەندی بە كەسانی دیكەوە بكات، واتا توانای بیركردنەوەو فێربوونیش پێوەندیی بە زمانەوە هەیە، فێربوونی ئەم سیستەمە ئاڵۆزەی زمان‌و یاساكانی بۆ كۆمەڵگایەكی دیاریكراوو تاكە كەسیش، بەتایبەتی لە ساڵەكانی سەرەتای ژیانیدا كە دەست پێ دەكات نیعمەتێكی گەورەیە.

مرۆڤ لە ڕێگای زمانەوە دەتوانێت ڕووداوە مادییەكان وەرگێڕێتە سەر هێماو، بە هۆی ڕشتەی وەرگرتنەوە كە بریتییە لە (چاو، گوێ، لووت) یاخود بە هۆی ڕشتەی درك كردنی نەبینراوەوە وەری بگرێت‌و بیگوێزێتەوە بۆ هۆش‌و بەشێكی زۆری ڕەفتاری هەوڵدان‌و هەڵە كردن بۆ خۆی دابین بكات‌و ئەمجا ئەم تاقیكردنەوەیەی خۆی بگەیەنێت بە كەسانی دیكە لە ڕێگای زمانی نوسراوەوە یاخود بیستراوەوە یان خوێندراوەوە.

زمان بە یەکێك لە روخسارەکانی مێشك دادەنرێتو ئامێرێکی گرنگە لە ئامێرەکانی بیرکردنەوە، سەردەمی ساوایەتی (الطفولة المبكرة) بە چاکترین قۆناغ لە ژیانی منداڵ دادەنرێت بۆ فێربوونو وەرگرتنی زەخیرەی زمانەوانی، ئەوەی کە مرۆڤ وەری دەگرێت دەبێتە کارێك لەگەڵ رەفتاریداو لێی جودا نابێتەوە، هەر زمانە کە مەردم دەبەستێت بە کۆمەڵەوەو دەبێتە هۆی دروستی کردن پەیوەندی لە نێوان خەڵکیدا، فێربوونی زمانیش لەسەر پێکهاتنی بایەلۆژی مرۆڤ و چوارچێوەی رۆشنبیریی ئەو کۆمەڵگایەی کە ئەو کەسەی تێدا دەژێت دەوەستێت، هەروەها زمان ئامێرێکە کە هەرگیز ناتوانرێت وازی لێبهێنرێت ئەویش لە دوو رووەوە:

**یەکەم:**

زمان ئامێرێکە بۆ دەرخستنی هزر لە کونو قوژبنی شاراوەوە بەرەو دەرەوە چونکە پێوەندی نێوان زمانو هزر زۆر توندو تۆڵە، زمان پێناسەی ئامادەکراو پێشکەش بە هزر دەکاتو رەوشتی شتەکان وەسف دەکات بۆ ئەوەی ئەو شتانە تێکەڵ بە یەك نەبن هەروەها یارمەتیی خاوەن بیر (مفكر) دەدات بە دەستەواژەی دەبڕینی زانراو بۆ



ئەنجامدانی کارەکەیو شێوازی پێشتر زانراو دەخاتە ژێر دەستی، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمەی مرۆڤ نابێت ئەوە لە بیر بکەین کە هەندێك جار کەمو کوڕی زمان بۆ بیرکردنەوە بۆ ناخی شتەکان تەگەرە دروست دەکات، بەم شێوەیە زمان دەتوانێت قاڵبی ئەوتۆ بە هزر ببەخشێت کە بتوانێت لەو قاڵبانەش بچێتە دەرێ.ئەگەر زمان نەبوایە هزر بەشاراوەیی دەمایەوەو دەر نەدەکەوت.

**دووەم:**

زمان کۆڵەکەی بیرکردنەوەی بێدەنگیو تێڕامانە، ئەگەر زمان نەبوایە مرۆڤ نەیدەتوانی بچێتە ناخی راستییەکانو تیشكو روناکی بخاتە سەر.

دەتوانین بایەخی زمان لەم خاڵانەدا کۆ بکەینەوە:

١. زمان مرۆڤ لە هەموو گیاندارانی دیکە جیا دەکاتەوە.

٢. زمان بە هۆی سیستەمە رەمزیە بەرفراوانەکەیەوە بۆ مرۆڤی ئاسان کردووە تا دەست بگرێت بەسەر جیهانی شتەکاندا.

٣. زمان بە کاسەیەك دادەنرێت کە مرۆڤ دەتوانێت بە هۆیەوە تاقی کردنەوەو خیبراتی خۆی لە ماوەی قۆناغەکانی گەشەکردنیدا تێدا هەڵگرێت.

٤. زمان پلەو پایە بە مەردم دەدات لە نێو کۆمەڵگاکەی، بە تایبەتی ئەگەرم زمانەکەی تەڕو پاراواتر بێت لە زمانی هاوڕێکانی.

٥. یارمەتی دەدات بۆ دروست کردنی ڕایەکی گشتی هاوچەشن بۆ مەسەلەکانی کۆمەڵ.

٦. ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە بواری دەروونناسیدا بۆ خستنە رووی ئەو کێشانەی کە مرۆڤ دووچاریان دەبێت ئەمیش لە ڕێگەی ئەو پێشنیارانەوە کە زمان پێشکەشی دەکات بۆ پاراستنی لە لادان و چاك بوونەوەی نەخۆش.

## پەیدابوونی زمان

زمان بە دیاردەیەکی مرۆڤایەتی دادەنرێت لە نێو هەموو گیاندارەکانی دیکەدا، زمان تایبەتە بە مرۆڤەوە، ئەمیش دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە چونکە یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ ئەوەی ببێت بە ئەندامێکی کاریگەرو خاوەن ڕۆڵێکی دیارو تایبەت بە خۆی لە نێو کۆمەڵدا.

سەرهەڵدانی زمان دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەردەمێکی زۆر کۆن وەکو کۆنیی مرۆڤ لە ماوەی قۆناغەکانی گەشەکردنی لە ژیاندا، ئەمیش خاڵی جیاکردنەوەی مرۆڤە



لە سەرجەم گیاندارانی دیکە، مرۆڤ لە ماوەی ژیانە دوورو درێژەکەیدا هەوڵی داوە ئارەزوو و پێویستی و هەستە جیاجیاکانی بە هۆی بەکارهێنانی ئامرازی جۆر بە جۆرەوە دەربڕێت تاکو لە پڕێکدا توانای دەربڕینی دەنگیی دۆزییەوە ئەم توانایەشی بە هەل زانی بۆ خولقاندنی زمان و پڕکردنەوەی پێویستیە زمانەوانییەکانی.

گومانی تێدا نییە کە قسەکردن فێربوونە،نەك زگماکە چونکە ئەگەر قسەکردن زگماك بوایە ئەم هەموو زمانانە پەیدا نەدەبوون، لێکۆڵینەوەکان سەلماندوویانە کە قۆناغەکانی گەشەکردنی ڕەفتاری زمان بە گوێرەی هەموو منداڵان یەکەو هیچ جیاوازی نییە لە نێوان ئەو قۆناغانە با ئەو زمانە هەر چۆنێك بێت لە ژینگەدا فێری دەبێت و وەری دەگرێت.

فێربوونی زمان زیاتر لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیان ڕوودەدات چونکە فێربوون پەیوەستە بە دایکەوە، هەر دایکە کە لایە لایە بۆ کۆرپەکەی دەکات و مەشقی دەنگە زمانییەکان پێ دەکات تاکو زمان دەگرێت دەتوانێت دەنگەکان لە جێگەی خۆیەوە بە شێوەیەکی دروست و بە پێی ئەو ژینگەیەی کە تێیدا ناسراوە دەربڕێت.

تاكو ئێستا ئێمە گەلێك ڕۆڵی پشتاوپشت (وراثة)و ژینگەمان سەبارەت بە كارامەیی (اكتساب المهارات) لە لا شاراوەیە، لەم ڕووەوە هەندێك لێكۆڵەر دەبینین كە پرۆسەی فێربوون بەوە شرۆڤە دەكات كە بریتییە لە كۆمەڵێك غەریزەی بۆماوە (موروث) یاخود بە كۆمەڵێك لە كاردانەوەی مەرجی وەگیراو (المنعكسات الشرطية المكتسبة)ی دادەنیت لەگەڵ ئەمەشدا كێشەی نێوان لایەنگرانی پشتاوپشت (الوراثة)و لاینگرانی ژینگە (البيئة) تاكو ئەمڕۆ نەگەیشتووەتە ئەنجامێكی بنەبڕكراو، چونكە تا ئێستا زۆر شت دەربارەی قۆناغەكانی گەشەكردنی كۆرپەڵەو كار ئەندامەكانی و پێوەندیان بە یەكەوە نەزانراوە، بۆ گەشەكردنی زمانی منداڵ دوو مەرجی بنەڕەتی هەن:

**یەكەم:** پێگەیشتنی هەندێك كۆئەندامو دەمارەشانەو ماسولكەشانەكانی.

**دووەم:** مەشق پێكردنی ئەندامەكانی ئاخاوتن لە كاتی پێگەیشتنیدا لە ڕێگای فێربوونەوە.

سەبارەت بە خاڵی یەكەم لێكۆڵینەوەكان ئەوەیان سەلماندووە كە ئەو لوول پێچانەی مێشك كە فەرماندەری ئاخاوتنن، ناگەن بە قۆناغی جیاكردنەوەی ئەندامی تاكو



تەمەنی منداڵ نەگاتە (١٧) حەڤدە مانگ بەڵام بنكە مێشكێیەكانی دیكە دوای تەمەنی (١١) یازدە مانگی پێدەگەن، هەروەها ئەو گۆڕانكارییانەی كە دێنە سەر شێوەو قەبارەی ڕشتەی دەنگدان كار دەكەنە سەر گەشەكردنی زمانی منداڵ، هەموومان دەزانین كە چۆن دەنگ دەگۆڕێت لە كاتی درێژبوونەوەی دەنگە ژێییەكان كە لە سەردەمی هەرزەكاریدا دەبێتە هۆی بێزاریو شەرم كردنی هەرزەكار لە دەنگە قەبەكەی خۆی.

سەبارەت بە خاڵی دووەم ئەگەر لە چەند بارودۆخێكی جیاوازدا تاقی كردنەوەیەكی لەسەر دوو منداڵی دووانەی لە یەكچوو (توأمين متماثلين) سەبارەت بە ڕاهێنان بۆ قسەكردن ئەوە ڕەچاو دەكرێت كە هۆی جیاوازی نێوانیان بۆ جیاوازی ئەو ناوەندە دەگەڕێتەوە كە تێیدا دەژین، (ستراير) لە ساڵی (١٩٣٠)دا تاقی كردنەوەیەكی لەسەر دوو منداڵی دووانەی (٨٤) هەفتەیی كرد، ئەم لێكۆڵەرە لە یەكەم هەفتەدا (٨٤) مەشقی تایبەتی بە یەكێك لە منداڵەكان كرد ئەویش بە نیشاندانی هەندێك شتو ناوهێنانی ئەو شتانە لەگەڵ هاندانی منداڵەكە بۆ لاسایی كردنەوەی دەنگەكان، بەم جۆرە ئەو منداڵە وای لێهات هەندێك لەو وێنانە بناسێتەوەو وەڵامی هەندێك فرمانی

ساكاریش بداتەوە، لە پاش تێپەڕبوونی (٥) پێنج هەفتە وشەكانی منداڵەكە لە یەك وشەوە زیادی كرد بۆ (٣٥) وشە، لە كاتی راهێنانی منداڵی یەكەم،منداڵی دووەم لە رووی قسەكردنەوە بە دوورە پەرێزی مایەوە، پاش تەواوكردنی مشەق پێ كردنی منداڵی یەكەم (ستراير) دەستی كرد بە راهێنانی منداڵی دووەم ئەوەی بۆ دەركەوت كە منداڵی دووەم خێراتر فێری زمان دەبێت لە چاو منداڵی یەكەم، هەر لە پاش تێپەڕبوونی (٤) هەفتە بەسەر مەشق پێكردنی منداڵی دووەم (٣٠) وشە فێربوو، تاكو ئێرە (ستراير) ئیتر تاقیكردنەوەكەی راگرت، هەر لە پاش تێپەڕبوونی چەند مانگێك ئەو جیاوازییە زمانییە لە نێوان هەردوو منداڵەكە بەتەواوی نەما.

لە تاقی كردنەوەی پێشوودا دەردەكەوێت كە منداڵی تەمەن گەورەتر زۆر كەڵك لە راهێنان وەردەگرێت بە گوێرەی ئەو منداڵەی كە هێشتا ئەندامەكانی بە تەواوی پێ نەگەشتوون بە مەرجێك زەمینەی زمانیی گونجاوی بۆ برەخسێت، گومان لەوەدا نییە كە مەشق كردن پێویستە بەڵام ئەگەر مەشقەكە لە پێش كاتی خۆیدا كرا ئەوا بەرهەمەكەی كەمتر دەبێت لە چاو ئەو مەشقە كە لەگەڵ پێگەیشتنی ئامرازەكانی دەربڕیندا دەكرێت.



## قۆناغەكانی زمان گرتن

زمان گرتنی منداڵ نیشانەی ئەوەیە كەوا خەریكە جێگای خۆی لە ناو كۆمەڵدا دەكاتەوەو هێدی هێدی مێشكی گەشە دەكاتو لە جیاتی بیركردنەوە لە خودی خۆی بیری بابەتیانە (موضوعي) دەكاتەوە لە جیاتی بیركردنەوەیەكی سادەو ساكار دەست دەكات بە درك پێ كردنی پێوەندی نێوان شتەكان، مەرجی سەرەكی ئەو گەشەكردنەش بوونی هاریكارییە لە نێوان منداڵو گەورەدا، هەر زمانەكە دەبێتە هۆی پێوەندی كردنی نێوان منداڵو گەورە، چونكە نە كەس لە خۆیەوە فێری زمان دەبێتو نە زمانیش دیارییەكە بخرێتە سەر موڵكی مەردوم بە بێ ماندوو بوونو شەكەتی، كەواتە پێویستە منداڵ لەسەر قسەكردنو فێربوونی شێوازی قسەكردن رابهێنرێت، دەتوانین بە دوو قۆناغ ماوەی زمان گرتنی منداڵ كورت بكەینەوە:

قۆناغی پێش زمان: قۆناغی جێ خۆشكردنو ئامادەبوون، كە ئەمیش بە دەوری خۆی بریتییە لە سێ سەردەمی لاوەكی (ثانوي):

یەكەم: سەردەمی هاواركردن (صراخ).

دووەم: سەردەمی گڕوگاڵ کردن.
سێیەم: سەردەمی لاسایی کردنەوەی دەنگە بیستراوەکان.

أ. قۆناغی پێش زمان.
ب. قۆناغی زمانی پڕ بە مانای وشە: لەم قۆناغەدا بەهرەی قسەکردن بە تەواوی پێدەگات.

### ١. قۆناغی هاوار کردن:

هاوکات لەگەڵ لە دایکبووندا منداڵ دەست دەکات بە هاوار کردن ئەم هاوارکردنەش بە یەکەم دەست پێشەخەریی (البادرە)ی توانای دەربڕینی دەنگ دادەنرێت، فەیلەسوف و پەروەردەکاران بایەخی زۆریان داوە بەم هاوارکردنە، لە ڕێگەی مەزندەکردن و گریمانەوە گەلێك شرۆڤەی بۆ کراوە، هەندێکیان بریتین لە هەندێك بیرو باوەڕی نادیارو ئەندێشاوی، بەڵام لەم بوارەدا ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە هاوارکردنی منداڵ مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو منداڵە بە کۆمەڵێك کۆئەندامی هەناسەدان و قوڕقوڕاگەی پێویستەوە هاتووەتە دونیاوەو ئامادەیە بۆ گەشەکردنی بەهرەی ئاخاوتن.



هاوارکردن بە سەرەتای گەشەکردنی زمان دادەنرێت، هەر زوو بە زوو منداڵ ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە بە هۆی ئەم هاوارکردنەوە دەتوانێت ئارەزووە پێویستییە جۆر بە جۆرەکانی پێ دەربڕێت، هاوارکردنیش شێوەیەکی خۆڕایە (عفوي) لە شێوەکانی هەڵچوون، دەتوانین ئەم هاوارکردنە بە جۆرێك لە ڕەنکدانەوەی هەست کردن بە برسێتی یان ئازار یاخود وەڕس بوون دابنێین، بەڵام ئەم هاوارکردنە لە یەکتر جیا ناکرێتەوە چونکە هاوار کردنێك نییە تایبەت بۆ برسێتی و دانەیەکی دیکەش بۆ ئێش و ئازار.. هتد.
دەتوانین بڵێین کە هاوارکردن روخسارێکە لە کاردانەوەی خۆنەویست (فعل انعكاسی لا ارادي) چونکە بەلای کەمەوە لە چەند مانگی یەکەمی ژیانی منداڵ، مەبەستی منداڵەکە لەم هاواکردنە شتێکی دیاری کراو نییە.

### ٢. قۆناغی گڕوگاڵ کردن:

منداڵ لە قۆناغی هاواکردنەوە کە قۆناغێکی کاردانەوەی خۆنەویستی (لا ارادي)ی ڕووتە، دەچێتە ناو قۆناغی گڕوگاڵ کردنەوە کە بەندە لەسەر گۆکردنی هەندێك بڕگەی دەنگیی بە شێوەیەکی خۆویست، ئەم گڕوگاڵ کردنەش

خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە ئامانجەکانی منداڵ کە مەبەستی نییە هیچ شتێکی پێ دەربڕێت، تەنها مەبەستی دووبارە کردنەوەو وتنەوەیەتی، وەکو بڵێی دەیەوێت دڵی خۆی پێ خۆش بکات. چۆن رێك بکەوێت بەو شێوەیەی دەری دەبڕێتو تامو چێژێکی لێ وەردەگرێت، لە راستیدا ئەو منداڵە مەشق بە کۆئەندامی دەنگ دەکات بۆ دەربڕینو کۆئەندامەکەی لەسەر دەربڕین رادەهێنێت بۆ ئەوەی بتوانێت بەشێوەیەکی دروست ئەرکی دەربڕین ئەنجام بدات.

منداڵ بە تەنیاو دوور لە خەڵکی ناژێت، هەر لەگەڵ تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەر تەمەنیدا دەبینرێت کە منداڵەکە وا خەریکە بایەخ بەو دەنگانەی مرۆڤ دەدات کە دەیبیستێت ڕوخساری ئەمەش بەوە دەردەکەوێت کە منداڵ هەر ئەوەندەی گوێ بیستی دەنگێك بوو ڕاستەوخۆ لە گڕوگاڵ دەکەوێتو گوێ لەو دەنگە دەگرێت یاخود بەرەو ئاراستەی سەرچاوەی دەنگەکە ئاوڕدەداتەوە، کاتێك کە تەمەنی گەیشتە (٦) مانگ وردە وردە دەتوانێت دەنگی لاواندنەوەو دەنگی توڕەبوون لێك جودا بکاتەوە، لە تەمەنی (٩) مانگیدا هەندێك وشەی باو کە لە دایكو باوکیەوە دەبیستێت لە مێشکیدا جێگیر دەبێتو زۆر



جاریش باوكو دایك وشەی بچووك کراو بەکار دەهێنن تاکو منداڵ دوور بخەنەوە لە پیتی گران، هەروەها منداڵ دەتوانێت هەندێك وەڵامی ساکار بداتەوەو لەهەندێك وشە تێبگات کە لەگەڵ هێما بۆ کردندا دەردەبڕدرێت، کاتێکیش کە تەمەنی دەگات بە ساڵێك وەڵامی هەندێك فرمان دەداتەوە، هەروەها لە نێوان تەمەنی (١٥) پازدەو (١٧) حەڤدە مانگیدا لە مانای ئەوە دەگات ئەگەر پێی بوترێت (ئەم شتەم بدرێ) لە دەوروبەری (١٨) هەژدە مانگیدا ئاوڕ لە ئەندامە جیاجیاکانی لەشی دەداتەوە.

لە کاتی چاودێری کردنمان بۆ گڕوگاڵی منداڵ ئەوە دەبینین، کە ئەو دەنگانەی دەریدەبڕێت دەگۆڕێتو هەرجارەی ڕەنگێكو جیاوازییەك بە خۆیەوە دەبینێت، لەوانە ژمارەی دەنگە بزوێنەکان لە گڕوگاڵ کردن منداڵ دا زیاترە لە چاو دەنگە نەبزوێنەکان، یەکەم جار بەو دەنگە بزوێنانە دەست پێ دەکات کە لە نێو بەشی پێشەوەی بۆشایی دەمدا دروست دەبن، هەروەها سەرەتای دەست پێ کردنی دەنگە نەبزوێنەکانی، ئەو دەنگانە دەبێت کە لە بەشی نێو دەمو زمانۆچکە دروست دەبێت، ئەو دەنگانە لەوپەڕی بۆشایی دەمەوە دەست پێ دەکەنو یەك لەدوای یەك لەگەڵ گەشە کردنو گەورە بوونی منداڵدا لە بەشی

دواوەی دەمەوە بەرەو پێشەوە دەکشێن.

هەندێك لە لێکۆڵەران وا دەبینن کە ڕێژەی بەکارهێنانی دەنگە بزوێنەکان بەرامبەر بە دەنگە نەبزوێنەکان دەبێت بە بەڵگە بۆ ئاماژەکردن بۆ گەشەکردنی دەربڕین لەو قۆناغەی کە دەکەوێتە پێش فێربوونی زمانەوە.

ئەم لێکۆڵەرانە گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە ڕێژەی دەنگە بزوێنەکان بەرامبەر بە دەنگە نەبزوێنەکان لەلای منداڵی شیرەخۆرە کە تەمەنیان ناگاتە (١) یەك مانگ ئەو ڕێژەیە (٥-١) دەبێت (واتا ئەو منداڵە بەرامبەر هەر (٥) پێنج دەنگی بزوێن (١) یەك دەنگی نەبزوێن فێر دەبێت "وەرگێڕەکان").

لێکۆڵینەوەی ڕەفتاری زمانی منداڵ یەکێکە لە ئاڵۆزترین کارەکان، چونکە تۆمارکردن قسەی منداڵ کارێکی گرانە، ئەم گرانییەش زیاد دەکات بە گوێرەی ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە دوو ساڵ کەمترە، بێگومان قۆناغی گڕوگاڵ کردنی منداڵ یەکەم هەنگاوی فێربوونی زمانێتی، سەرەتای ئەم گڕوگاڵ کردنەش بریتییە لە شێوەیەك لە شێوەکانی یاری کردنی منداڵ،پاشان ئەم یاری بە دەنگ کردنە دەگۆڕێت بۆ ڕەفتاری قسەکردنی ڕاستەقینە لە هەر زمانێك لە زمانەکانی جیهان، بەڵام ئێمە



بەوردی میکانیزمی ئەم گۆڕانە نازانین هەر ئەوەندە دەزانین کە لە قۆناغی گڕوگاڵ کردندا بڕێك دەنگو پیت کە منداڵ بۆ گۆ پێ کردن مەشقی لەسەر دەکات، هەر کە منداڵ گەورەبوو بە پێی پێویست لەو بڕە دەنگو پیتانە هەڵدەبژێرێتو بەکاری دەهێنێت، کاتێك کە منداڵ لە گەورەوە فێر دەبێت ئەوە دەدۆزێتەوە کە ئەو دەنگانە لەگەڵ دەنگی دیکەدا بەکار دەهێنرێتو لە ڕووی دەربڕینەوە کار لە یەکتر دەکەن، جارێك دەنگەکان ئاوێتە (ادغام) دەکاتو جارێکی دیکەش درێژە بە دەنگەکان دەداتو هەندێك جاریش تەنها لێوی دەجولێنێتەوە.

لە جیاتی ئەوەی منداڵ دەنگەکان بە شێوەیەکی جیاو لێك دابڕاو بەکار بهێنێت وردە وردە ئەم دەنگانە لە چوارچێوەی وشە یاخود ڕستەی تەواودا بەکار دەهێنێت، تێکەڵ کردنی گڕوگاڵی منداڵ بۆ ناو زمان بە شێوەیەکی لە خۆوە (عفوي) نابێت بەڵکو پێویستی بە گوێ گرتنو لاسایی کردنەوەو فێربوون هەیە.

## قۆناغی لاسایی کردنەوەی دەنگە بیستراوەکان

لە پاش قۆناغی گڕوگاڵ کردن منداڵ هەوڵی لاسایی کردنەوەی ئەو دەنگانە دەدات کە دەیبیستێت بە تایبەتی دەنگی ئادەمیزاد.

بەم کارەش بۆ خۆی وشەی نوێ دروست دەکات، گەورەش سەرنج دەداتە وشە نوێیەکانی و دەیەوێت بەهەمان وشە بیدوێنێت، واتا گەورە دادەبەزێتە ئاستی زمانی ئەو منداڵەو لاسایی زمانی منداڵەکە دەکاتەوە بەڵام ئەم لاسایی کردنەوەش زۆر ناخایەنێت تاکو ئاراستەکەی سەرەو ژێر دەبێتەوە واتا لە جیاتی ئەوەی گەورە لاسایی منداڵ بکاتەوە بە پێچەوانەوە منداڵەکە دەست دەکات بە لاسایی کردنەوەی زمانی گەورەو زمانی پاك دەبێتەوەو تێکەڵی ئەو ناوەندە (وسط) دەبێت کەتێیدا دەژێت، پێویستە ئاگاداری ئەوەبین کە گۆڕان لە قۆناغی گڕوگاڵ کردنەوە بۆ لاسایی کردنەوە کتوپڕ روو نادات، چونکە لە راستیدا قۆناغەکانی گەشەکردنی زمان تێك هەڵکێشن.

سەرەتای لاسایی کردنەوەی زمانی منداڵ لە یەکەم ساڵی تەمەنیەوە دەردەکەوێت هەر کە گوێی لە وشەیەك دەبێت دەست دەکات بە دووبارە کردنەوەی ئەو وشەیە



تاکو لە مێشکیدا دەچەسپێت. زانایان وا دەبینن کە منداڵ جۆرە مەیلێکی هەیە بەرامبەر بەو دەنگەی خۆی کە دەریدەبڕێت، ئەو دەنگەش لە شێوەی دەنگدانەوە (صدى) دەبێت، کە منداڵ شتێك دەردەبڕێت و گوێی لە دەنگەکەی دەبێت ئەم دەنگەش وەکو هۆڕنێك (منبه) وڵامدانەوەیەك لە ناخی منداڵەکەدا دروست دەکات، ئەم وەڵامدانەوەش بریتییە لە دووبارەکردنەوەی دەنگە دەربڕاوەکە وەکو دەنگ دانەوەیەك، بەم جۆرە منداڵ بە پابەندی دەنگەکەی خۆی دەمێنێتەوە تاکو لەم بازنە دەنگییەدا دەرباز دەبێت.

مەرج نییە ئەو دەنگەی کە وەڵامدانەوەی بازنەیی دروست دەکات هەر دەنگی منداڵەکە خۆی بێت دەشێت منداڵ دەنگی باوکی یان دایکی ببیستێت و ڕەنگە ئەم دەنگانەش وەڵامدانەوەی بازنەیی لە منداڵەکەدا دروست بکەن و وا لە منداڵەکە بکەن کە لاسایی ئەم دەنگانە بکاتەوە، دەتوانین بڵێین فێربوونی دەنگە زمانییەکان کاتێك دەست پێ دەکات کە ئەم بازنە زمانییەی لەلا دروست ببێت، لێرەدا پێویستە لەسەر پەروەردەکار (المربي) لەگەڵ گۆکردنی ناوی هەر شتێك، ئەو شتە پیشانی منداڵەکە بدات و داوای لێ بکات لاسایی ناوە وتراوەکە بکاتەوە پاشان منداڵەکە دەچێتە قۆناغێکی

تازەوە كە تێيدا خۆی شتەكان وەكو ئاگاداركەرەوەيەك دەبن بۆی، هەر ئەوەندەی كە شتێكی بینی كە پێشتر ناوی بیستووە یەكسەر دەیناسێتەوەو ناوەكەی گۆ دەكات، وەلآمدانەوەی بازنەیی منداڵ بە روخسارێكی زەق لە منداڵدا دەمێنێتەوە تاكو تەمەنی دەگاتە دوو ساڵو نیو.

لەم دواییەدا (زییف) (١٩٤٩) سەبارەت بە منداڵێكی (٢٢) مانگی ئەوەی تۆمار كردووە كە منداڵێك بانگی داپیرەی دەكاتو لەگەڵیدا دەدوێتو وەلآم دانەوەی بازنەیی لە نێوانیاندا سیفەتی دیاری ئەم گفتوگۆكردنە دەبێت، بوونی ئەم وەلآمدانەوە بازنەییە هاوكێش كردنی زمان لە ڕەفتاری زمانی منداڵ راگیر دەكات، لێرەدا مەبەست ئەوەیە كە منداڵ بە وشەیەك ڕستەیەكی تەواو دەردەبڕێت.

## قۆناغەكانی فێربوونی زمان

### یەكەم: فێربوونی وشە

قۆناغی پێشتر بە قۆناغی خۆ ئامادەكردن دادەنرێت، پاش ئەم قۆناغە منداڵ بۆ قۆناغی زمانیی دەپەڕێتەوە، زانایان سەرەتای ئەم قۆناغە بە گشتی بە ساڵی یەكەم لە تەمەنی زۆربەی منداڵان دەست نیشان دەكەنو نزیكەی



(٩) مانگانیش بۆ منداڵە خورتو وریاكان دادەنێن، لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بكرێت كە هەردوو قۆناغەكە تێك هەڵكێشن، بە تایبەتی لەو كاتەدا كە منداڵەكە وا خەریكە دەست بكات بە لاسایی كردنەوەی ئەو دەنگانەی كە گوێی لێ دەبێت.

زۆربەی ئەو وشانەی كە منداڵ بۆ یەكەم جار گۆی دەكات، وشەی تاكە بڕگەی دووبارە كراوە دەبێت وەكو: ماما، بابا، دادا.. هتد)، ئەم وشانەش بەلای منداڵەوە ڕستەی تەواون چونكە جێگای ڕستەی تەواو دەگرنەوە ئەویش بەوەی كاتێك دەڵێت (بابا) مەبەستی ئەوەیە كە باوكی دەوێت، منداڵ لە میانەی خودی خۆیەوە دەڕوانێتە ئەو وشانە، واتا لە میانەی ئارەزوو و پێویستییەكانیەوە بۆیان دەڕوانێت.سەرەتا دەسكەوتی منداڵ لە فێربوونی وشەدا زۆر بە هێواشی دەست پێ دەكات، پاشان لە نێوان تەمەنی دوو ساڵیدا بە خێرایی دەڕوات، ئەمجار تا دەگاتە تەمەنی خۆناسینەوە بە سستی دەڕوات، ئەو گیروگرفتە بنەڕەتیانەی كە ڕووبەڕووی پەروەردەكاران دەبنەوە بریتین لە نەبوونی دەست نیشان كردنی ئەو زیادبوونە، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١. تەنها بۆ ماوەیەكی دیاری كراو نەبێت (پەروەردەكار)

ناتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەگەڵ منداڵەکەدا بمێنێتەوە.

٢. دیاری کردنی پێوەری زانیاری، واتا ئەو بەڵگانە چین کە پشتی پێ ببەسترێت بۆ ئەوەی بوترێت منداڵەکە ئەم وشەیە دەزانێتو ئەوی دیکەیان نازانێت؟

هەندێك لە توێژینەوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن (وەکو: سمیث)و دەڵێن: کاتێك منداڵ تەمەنی دەگاتە یەك ساڵ تەنها (٣) سێ وشە فێر دەبێت بەڵام لە کۆتایی دووەم ساڵی تەمەنی (٢٧٢) وشەو لە تەمەنی چوار ساڵیدا (١٥٤٠) وشەو لە تەمەنی شەش ساڵیدا (٣٥٦٣) وشە فێر دەبێت، هەر کە تەمەنی گەیشتە شەش ساڵ ئیتر کاتی خوێندنی دێتە پێشەوەو بەردەوام زەخیرەی زمانی زیاد دەکات.

منداڵ لە فێربوونی وشەدا یەکەم جار فێری ناو دەبێت، بە تایبەت ناوی ئەو کەسانەی کە لەگەڵیاندا دەژێت واتا منداڵ لە قۆناغی یەکەمی ژیانیدا زیاتر فێری ناو دەبێت، هەر بۆیەش هەندێك لە دانەران پێی دەڵێن قۆناغی ناولێنان، چونکە خەمی منداڵ تەنها زانینی ناوی شتەکانە.



لە کۆتایی ساڵی دووەمی تەمەنیدا، بۆ یەکەم جار منداڵ دەست دەکات بە بەکارهێنانی جێناوەکان، لە دەوروبەری ساڵی دووەمیش وردە وردە کرداریش لە قسەکردندا بەکاردەهێنێت کە چی هێشتا ناو زۆرتر بەکار دەهێنێتو تاکو دەگاتە تەمەنی (٣٠) سی مانگی ئیتر بەکارهێنانی ناو کەم دەکاتەوە لە جیاتی ئەوە جێناوو، ئاوەڵناوو، هەندێك ئاوەڵکردارو پێشبەند زیاتر بەکاردەهێنێت.

هۆی بەکارهێنانی (ناو) لە پێش بەکارهێنانی کردارو بەشەکانی ئاخاوتن بەوە ڕاڤە دەکرێت کە:

١. سوودبەخشی (النفعیە): زانینی ناو سوودبەخشترە لە زانینی کردار چونکە زیاتر پێویستی بە زانینی ناوە.

٢. کەم توانایی منداڵ بۆ کورتکردنەوە (رووت کردنەوە– التجرید) چونکە ناو کورتترین بەشی ئاخاوتنە بە گوێرەی کردارو جێناوو ئاوەڵناوو ئاوەڵکردارو پێشبەندو ئامرازەکانی مەرجو پرسیارو سەرسوڕمان ئامرازی فرمانو نەرێو تووڕەبوونو.. هتد.

**دووەم: ڕۆنانی ڕستە**

زەخیرەی زمانیی لەلای منداڵ تەنها بە ژمارەی ئەو وشانە ناژمێردرێت کە دەیزانێت بەڵکو پێویستە وشەکان بە چاکی بەکاربهێنێت. یەکە (وحدە)ی زمان لەلای منداڵ وشە نییە، بەڵکو ڕستەیە. ئەگەر منداڵ خاوەنی بڕێکی وشەی باش بوو ئەوە پیشان دەدات کە کاتێك ئەو منداڵە گەورەبوو زمانی پاراو دەبێت ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئەم منداڵە لە پاشە ڕۆژدا لە چاو منداڵێکی لە خۆی بێدەنگ تر زمانی پاراوتر دەبێت، بۆیە بە تەنها وشە نابێتە هۆی بڕیاردان لەسەر چاك زانین و گەشەکردنی زمانیی لەلای منداڵ بەڵکو پێویستە درێژی و ئاڵۆزی ڕستە لە بەرچاو بگیردرێت بۆ منداڵێك کە هێشتا نەچووبێتە بەر خوێندن، دەتوانرێت سێ قۆناغ بۆ دروست کردنی ڕستە دیاری بکرێت، وەکو:

أ. قۆناغی بەکارهێنانی یەك وشە لە جێگەی یەك ڕستە: لە تەمەنی یەك ساڵییەوە تاکو دەوروبەری دوو ساڵی، هەندێك جار مەبەستی منداڵ لە بەکارهێنانی وشەی (دایکە) بە تەنها مەبەستی ئەوەیە بڵێت (دایکە وەرە).

ب. قۆناغی ڕستەی ناتەواو (لە تەمەنی دوو ساڵییەوە



تاکو چوار ساڵی): مەبەستی لە ڕستەی ناتەواو وشەیە (دوو وشە یان زیاتر) کە لە پاڵ یەکترەوە دادەنرێت بێ ئەوەی ڕستەی تەواوی لێ دروست بکرێت.

ج. قۆناغی ڕستەی تەواو (لە چوار ساڵییەوە دەست پێ دەکات): ئەوە تێبینی دەکرێت کە منداڵ لە سەرەتای ساڵی سێیەمەوە وردە وردە ڕستەی سادە کەمتر بەکار دەهێنێت و ڕستەی ئاڵۆزتر جێگە ڕستەی سادە دەگرێتەوە، مەبەستمان لە بەکارهێنانی ئەو ڕستانەیە کە ئاوەڵناوو ئامرازەکانی نیشانەو ئاوەڵکردارو.. هتد، تێدا بەکاردەهێنێت.

بەڵام کاتێك کە منداڵ لە تەمەنی شەش ساڵی تێدەپەڕێت دەست دەکات بە ئەرکی داڕشتن، ئەمەیش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئیتر منداڵەکە ڕستەی سادە بەکارناهێنێت، بەڵکو ڕێژەی بەکارهێنانی ڕستەی سادە کەمتر دەکاتەوە، هەروەها منداڵ لە قۆناغی خوێندندا دەست دەکات بەمەشق کردن بۆ وەرگرتنی (اکتساب)ی یاسا ڕێزمانییەکان کە دەبێتە هۆی پاراستنی زمانی منداڵ لە هەڵە زمانیی و فێربوونی وشەی تازەترو درك کردنی مانای وشەکان لە میانەی (السیاق) ئاخاوتندا.

## تیۆرەکانی پەیدابوونی زمان

بۆ زانینی چۆنیەتی پەیدابوونی زمان، کۆمەڵێك مێژوونووس و دەروونناس وخاوەن بیرو پیاوی ئایینی لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا بەشدارییان کردووە لەبەر ئەوەی بناغەی زمان هێندە کۆنەو کۆنترە لەو زانیارانەی کە دەربارەی ژیانی ئادەمیزاد بەدەست کەوتووە، لێکۆڵەران پەنایان بردووەتە بەر بیروباوەڕی ئەفسانەیی و شتی نادیار (المغیبات) کە بریتین لە کۆمەڵێك بیروڕای گریمانی (الافتراضیة) کە بە هیچ شێوەیەك بەرامبەر بە لێکۆڵینەوەی وردی زانایان خۆ ڕاگیر ناکەن.

ئێمە هەوڵ دەدەین تاکو بتوانین کۆمەڵێك لەو بیرودۆزانەی کە سەر هەڵدانی ئەم دیاردە مرۆڤایەتیە شرۆڤە دەکەن، بخەینەڕوو.

**تیۆری یەکەم: زمان بەهرەی خواکردە (الهام)ە.**

هەندێك لە زانایان وا دەبینن کە زمان بەهرەیەکی خوا کردە، واتا لە خواوەیە، هەر خوایە کە ئادەمی فێری ناوی هەموو شتێك کردووەو ڕێگای پێشان داوە بۆ بڕگە دەنگییەکان، بەم کارە ئادەمیزاد توانیویەتی وشە دروست



بکات و لێکیان بدات و پیت و دەنگەکانیشیان بەمانکانیانەوە ببەستێتەوە، ئەمیش یان بە ڕێگای سروش (الوحي) یان بە خولقاندنی دەنگ لە هەندێك ئەندامدا، گریکەکان یەکەم میللەت بوونە کە بڕوایان بەم بیروبۆچونە هەبووە.

(هیراقلیت)ی فەیلەسووفیش بە پێشەوای ئەم بۆچوونە دادەنرێت، لە هەردوو چاخی ناوەڕاست و تازەدا جوولەکەو هەندێك لە پیاوانی کەنیسەی فەلەکانی ڕۆژئاوا، لەم ڕووەوە هەمان بیوربۆچوونیان هەبووە، زانا موسڵمانەکانیش هەر هەمان بیروبۆچوونیان هەبووە، زمانیان بە سروشی خوایی داناوە، ئەمان زمانی عەرەبیان بە زمانی پیرۆز داناوە، بۆ سەلماندنی قسەکانیان پشت بەو ئایەتە پیرۆزە دەبەستن کە دەفەرمێت: ((وعلم آدم الاسماء کلها))، هەروەها پێیان وایە کە زمان بریتییە لە ناو.

**تیۆری دووەم: زمان ڕێکەوتنە (اللغة اصطلاحیة):**

زانایان وادەبینن کە زمان ڕێکەوتن و لاسایی کردنەوەیە، مرۆڤ لە ڕێگای پێکەوە ژیان زمانی دەست کەوتووە، ئەم لێکۆڵینەوەیە بە یەکێك لە بەروبوومی لێکۆڵینەوە

زانسیتییەكان دەژمێردرێت هەر چەندە ئەم بیردۆزەیە بە ئامرازە ساكارەكانی چاخەكانی ناوەڕاست بەدەستهێنراوە لەگەڵ ئەوەشدا بە قەد تێوری یەكەم بایەخدارە.

(ابـو الفـتح ابـن جـنی) بـە گـەورترین لایـەنگرانی ئـەم بیردۆزەیە دادەنرێت، گەلێك لق و پۆپی دیكە لەم بیردۆزەیە دەبێتەوە، وەكو:

**أ. ڕێگای ئاڵوگۆڕكردنی بیرورا :**

بە كورتی ئەم ڕێگایە بریتیە لەوەی كە لەناو هەموو كۆمەڵگایەك كۆمەڵێك خەڵكی خودان بەهرەو تێڕوانین دەبێت، كە هەست بە پێویستی كۆمەڵگاكەیان دەكەن بۆ هەندێك وشە كە لە زمانەكەیاندا نییە، بۆیە ئەمان دەست دەكەن بە دانانی وشە تاكو یارمەتی ئەو خەڵكە بدات بۆ بەهێزكردنی پێوەندی نێوانیان، وشەكان بڕیاران لەسەر دەدرێت و ئەمجا بە نێو ئەو كۆمەڵگایەدا بڵاو دەبێتەوەو تێكەڵی زمانەكەیان دەبێت، (ابن جني)یش یەكێكە لە لایەنگرانی ئەم بیروبۆچوونە،بەڵام خۆی و هاوڕێ لایەنگرەكانی ئەم ڕێگایە نەیانزانیوە كە ڕێگاكە پێویستی بە ئاگادارییەكی زۆرە لە بواری زمان و پلەو پایەیەكی شارستانێتی پێشكەوتووی دەوێت، هەروەها زمانیش لە



ڕووی گەشەكردنەوە مەیلی ئەوە دەكات كە لە ئاسانییەوە بەرەو گرانترو لە شێوەی ساكارەوە بەرەوە ئاڵۆزیی بڕوات، ئەم وتانەیان بە تەواوی پێچەوانەی بیروبۆچوونەكانی خۆیانە.

(ریچارد باگێت) وای دەبینێت كە وشە هێمای دەنگییەو مرۆڤ لە كاتێكدا دایهێناوە كە لە تاریكیدا ڕێی كردووەو ئەم تاریكیەش بووە بە كۆسپێك لە ڕێگەیدا بۆ بەكار هێنانی جوڵە –هێما (الاشارات الحركیە)، (جوڵە –هێماش بەلای "باگێت"ەوە پێش هێمای دەنگیی كەوتووە) مرۆڤ كاتێك كە دەستی گیرابووە (واتا كاتێك كە شتی بە دەستەوە بووە) پەنای بۆ هێمای دەنگیی بردووە چونكە نەیتوانیوە جوڵە هێما بەكار بهێنێت.

**ب. ڕێگای لاسایی كردنەوە (المحاكات):**

گریكەكان بە پێشەوای ئەم بیروبۆچوونە دادەنرێن. (دیموقریت) وای بۆ دەچێت كە زمان لە ڕێگەی هەوڵدانیەوە بۆ لاسایی كردنەوەی واتا مادیەكان لە جیهانی سروشتدا پەیدابووە.

لایەنگرانی ئەم بیروبۆچوونە بڕوایان وایە كە مرۆڤ خۆی لە خۆیدا لە ناو جیهانێكدا بینیوەتەوە كە پڕ بووە لە جۆرەها هێزی سروشتی دەنگدارو بێ دەنگ لە دەوروبەری

خۆی گوێی له دەنگی کارلێکی (تفاعل)ی ئەم هێزه سروشتیانه بووه، وەکو دەنگی هەوره تریشقەو دەنگی باران و وەڕەوەڕی سەگ و خوێندنی کۆترو کۆمەڵێك دەنگی دیکەی جیاواز له رووخسارو سەرچاوەدا، بەم شێوه مرۆڤ فێری یەکەم زمان بووه، له سەرەتادا زمانەکەی تەنها بریتی بووه له لاسایی کردنەوەی دەنگێکی دیاریکراو تاکو مانای سەرچاوەی دەنگەکەی پێ دەربڕێت پاشان ورده ورده به هەڵچەرخاندن و گۆڕینەوەو هەڵکۆڵیندا تێپەربووه تاکو ئەو دەنگانه بوونه به وشه، زمان لەم گۆڕانکاریەدا بەردەوام بووه تاکو بووه به پێکهاتەو دەربڕین، زاناکان پێیان وایه که له سەرەتادا زمان تەنها یەك بڕگه بووەو پێکهاتووه له یەك پیت، یاخود له دوو پیتی بزوێن ئەمجا نەبزوێن و پاش ئەوه پیتی دووەم زیادکراوه بووه به سێ پیت، یاخود بڕگه دووه هەندە (ضعف) کراوەو بووه به بڕگەی چواریی.

سەرەرای ئەوەی که بنەمای ئەم تێڕوانینه لاسایی کردنەوەی سروشته که چی زاناکان لەسەر روخسارو شوێنی پەیدابوونی ئەم لاسایی کردنەوەی سروشته تەبانین.

١. یەکێك لەو رایانه وای بۆ دەچێت که پەیدا بوونی



زمان لاسایی کردنەوەی ئەو هەموو شتانەیه که لەگەڵ سروشتدا رێکن، بەم بۆچوونەش دەوترێت تێوری (بوو – وو (Baw - waw) به پێی ئەم بیردۆزەیه بنەمای زمان دەگەڕێتەوه بۆ لاسایی کردنەوەی دەنگه سروشتیەکان، ئەم دەنگانەش لەناو زۆر دەربڕیندا تێبینی دەکرێت، پشیله له زمانی چینی و میسریدا پێی دەگترێت (موو) ئەمەش مانای ئەوەیه که ناوی ئەم گیانداره له سەرچاوەی دەنگەکەیەوه وەگیراوه.

شایانی باسه ئاماژه بۆ ئەوه بکەین که له زمانی کوردیدا ناوی ئەم گیانداره واتا پشیله له (پش – پش)ەوه وەگیراوه ئەمشه ئەوه دەگەیەنێت که کورد ناوەکەی له دەنگی گیاندارەکەوه وەرنەگرتووه، هەورەها له هەندێك شوێندا وشەی (کتك)ی بۆ بەکار دەهێنرێت که ئەمیش له (کت – کت)ەوه وەرگیراوه (وەرگێڕەکان).

هەر له زمانی چینی و میسری بۆ تاووس (کوو – کوو) بەکار دەهێنن و بۆ چۆلەکەش (زقزقه).

٢. بیروبۆچوونێکی دیکه ئەوەیه ئەو وشانەی که مرۆڤ یەکەم جار دەری بڕیوون بریتی بووه له هەندێك

دەنگی سۆزدار بۆ دەربڕینی سەرسووڕمان یان خۆشی یان دڵتەنگی یان ئێش و ئازار، بۆ نموونە وشەی (ئۆف) دەنگێکە لە زمانی عەرەبیدا بۆ بێداریی بەکار دەهێنرێت و وشەی (وەیل) بۆ ئاخ هەڵکێشان بەکار دەهێنرێت، هەروەها ئینگلیزە کۆنەکان دەڵێن (Wa - la) بەم بۆچوونەش دەوترێت)بیردۆزەی پوە پوە.)Pooh - pooh

٣. بیروبۆچوونێکی دیکە هەیە دەڵێت هەندێك دەنگ روخساری مەعنەویان هەیە عەرەب لەم مەیدانەدا بە پێشەوا دادەنرێن، هەندێك نموونە بۆ ئەم مەبەستە دەهێننەوە وەکو: پیتی (الغین) مانای، تاریکی و گرژی و ون بوون و دڵتەنگی دەبەخشێت، بۆ روونکردنەوەی ڕاکەیان ئەم نموونانە دەهێننەوە (غم، غیم، غبن، غبطه) بە رای ئەمان زمان لێرەوە گەشەی کردووە.

٤. ڕای چوارەم وایە کە زمان لە سەرەتادا بریتی بووە لە هەندێك دەنگ کە مرۆڤ لە کاتی کاری رۆژانەیدا دەریبڕیوە. جا کاتێك کە چاڵێکی هەڵکەندووە یاخود بە دوای نێچیرێکدا ڕای کردووە یان خەریکی بەرد شکاندن بووە، لەم کاتانەدا هەندێك دەنگی



دەربڕیوە کە مانای ماندووبوونیان بەخشیوە وەکو (یە)و (هە)و (هوە) ئەم بیردۆزەش بە بیردۆزەی (یو – هی – هو) دەناسرێتەوە.

**بیردۆزە نوێیەکانی پەیدابوونی زمان**

لەبەر تیشکی پرۆگرامی نوێ، لێکۆڵەران دەستیان داوەتە لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی زمان لە زۆر کۆنەوە، بۆ ئەم مەبەستە چەند بیردۆزەیەك پەیدا بووەو چۆنیەتی سەرهەڵدانی زمان راڤە دەکەن، وەکو:

١. **بیردۆزەی بەراوردکاری زمانیی (نظرية المقارنة اللغوية):**

ئەم بیردۆزەیە لە پاش دۆزینەوەی هەندێك لە زمانەکانی شارستانیەتە کۆنەکانی وەکو شارستانیەتی میسری و ئاشووری و بابلی و حەبەشی پەیدابووە.

زاناکان بڕوایان وابووە کە بە ڕێگەی بەراورد کردنی ئەم زمانانە دەتوانن چۆنیەتی پەیدابوونی زمان بزانن، ئەوەی هانی داون بۆ بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیە، ئەم بڕوایە بووە لە مێشکیان، کە زمانی هەندێك لەو گەلانەی کە هێشتا لە قۆناغی شارستانیەتی دواکەوتوودان، وەکو گەلە ڕەسەنەکانی ئوستراليا و نیوزیلەندا زمانی ئەم گەلانە وەکو زمانی گەلە پێشکەوتووەکانی

شارستانیەت وایە، بەڵام ئەو زانایانە ئەوەیان لە بیر کردووە کە زمان هەر چۆنیەك بێت هەرگیز لە گەشەکردن ڕاناوەستێت جا چی ئەو گشەکردنە بەرەو پێشەوە یان بەرەو دواوە بێت، لەبەر ئەوە زاناکان سەرنەکەوتن بۆ بەدەست هێنانی ئەنجامی باش بۆ دۆزینەوەی ئەم مەسەلەیە.

**٢. بیردۆزی لێکۆڵینەوەو گەشەکردنی زمانی منداڵ:**

ئەم بیردۆزەیە پشت بە پێشکەوتنی ئەو لێکۆڵینەوە پەروەردەیی و سایکۆلۆژییە دەبەستێت کە لەسەر منداڵ دەکرێت، زاناکان هەنگاو بە هەنگاو کەوتوونە دوای لێکۆڵینەوەی زمانی منداڵ هەر لە سەرەتای لە دایك بوونیەوەو بە درێژایی قۆناغەکانی سەردەمی منداڵی تاکو گەیشتنە ئەنجامی کۆمەڵێك بیروبۆچوون ئەویش:

- بۆ ئەوەی منداڵ فێری زمانێك ببێت پێویستە لە سەری لەناو کۆمەڵێکدا بژێت، ئا لێرەدا گرنگی و پێویستی پێوەندی زمان بە کۆمەڵەوە بۆ هەندێك کەس دەردەکەوێت.

- منداڵ کە لە دایك دەبێت هیچ زمانێك نازانێت بەڵام هەر کە خاسیەتی دەنگیی بۆ ئاشکرا بوو، هەستی زمانیی دەست پێدەکات.



- وەڵامدانەوە (استجابە)ی زمانی بە شێوەیەکی ڕەمەکی (عشوائي) دەست پێدەکات پاشان بە هێما بۆ کردن (ترمین) کۆتایی دێت، هێما بۆ کردنیش میراتێکی کۆمەڵایەتیە بە گوێرەی ئەو تایبەتمەندییەی کە هەیە بە هیچ شێوەیەك بە کۆششی لە ناکاو دانانرێت.

- زمان لە بنەڕەتدا بریتییە لە دەربڕینی حاڵەکانی هەڵچوون (الحالات الانفعالیە)، ئادەمیزاد ناتوانێت بە بێ هەڵچوون بژێت.

- بناغەی زمان لەلای ئادەمیزاد زاڵبوونە بەسەر واقیعدا، واقیعیش خۆی بە هێزو جۆراوجۆرە، جا بۆ ئاسانکردنی ڕێگەلێگرتنی دەبێت هێمای بۆ دابنرێت.

- بناغەی زمان بریتیە لە دەربڕینی مانا شاراوەکانی ناو ناخی ئادەمیزاد، لەناو ناخی مرۆڤدا هێزێك هەیە کە دەتوانێت ئەوەی لە ناخیدا خول دەخواتەوە بە وشەی گۆکراو دەری ببڕێت.

هزر هەمیشە هەوڵی داوە بۆ پاڵنانی ئەو هێزەی ئاەمیزاد کە شت دەردەبڕێت بۆ خستنەڕووی بیر (الفکر)، لە سەرەتادا وشەی ساکار بەکار هێنراوەو پاشان ئەم وشە ساکارانە پەرەیان سەندووەو مرۆڤیان گەیاندووە بە ئاوو هەوایەکی زمانی.

کۆمەڵناسەکان بڕوایان وایە کە یەکەم تۆوی سەرهەڵدانی کۆمەڵ پێویستی بە زمان هەبووە بۆ پتەوکردنی ئەم پێکهاتە کۆمەڵایەتییە نوێیە، چونکە لە یەکتر نەگەیشتنی خەڵکی کۆمەڵگا دەبێتە هۆی تەگەرە دروست کردن لەسەر ڕێگای گەشەکردن و پێشکەوتنیان، بەڵام کۆمەڵناسەکان گرنگییان نەداوە بە چۆنیەتی سەرهەڵدانی زمان، هەر ئەوەندەیان بەلاوە گرنگە کە زمانێك هەبێت خەڵکی بە هۆیەوە لە یەکتر بگەن و ببێتە هۆی گەشەکردنی ئەو خەڵکە لە حاڵێکەوەبۆ حاڵێکی باشتر.

## ئەرکەکانی زمان

زمانی دەنگی بەسەر دوو جۆردا دابەش دەبێت: جۆری هەڵچوونی ویژدانی (الانفعالي الوجداني)و جۆری ڕەمزی (زمانی بیرکردنەوەو درك پێکردن)، ئەم دابەش کردنەش دابەشکردنێکی زانستیە لەسەر هەندێك ڕاستیی چەسپاو بە گوێرەی کار ئەندام زانی ئەندامەکان (علم وظائف الاعضاء) بنیات نراوە.

لە یەکێك لەحاڵەتەکانی لاڵبوون (الافازیا)دا دەکەرتووە (الافازیا)ش بریتییە لە دەستدانی توانای قسەکردن لە



ئەنجامی تێکچوونی مێشك، مرۆڤ توانای بەکارهێنانی ڕەمزی نامێنێت (واتا قەسەکردن).

تەنها زمانی ویژدانی دەمێنێتەوە، واتا ئەو زمانەی کە فێری بووە لە دەست دەچێت و تەنها زمانی سروشتی و ویژدانی بۆ دەمێنێتەوە (واتا توانای قسەکردنی نامێنێت و تەنها بە ئیشارەت قسە دەکات) (وەرگێڕەکان).

زمان چەندان ئەرکی هەیەو دەشێت ئەو ئەرکانەش بکرێن بە دوو پۆلەوە:

– پۆلی ئەرکە بنەڕەتیەکانی زمان.
– چەند ئەرکێکی دیکە.

### أ. ئەرکە بنەڕەتییەکانی زمان، وەکو:

١. ئەرکی هەست دەربڕین (زمان وەك ئامێرێکی دەربڕین)، دەربڕین یەکێکە لە بنەڕەتیەکانی زمان، چونکە لە کاتێکدا هەندێك وشە دەدرکێنێت مەبەستی ئەوەیە شت دەربڕێت واتا هەستو سۆزی بیری خۆی بۆ دەرەوە دەربڕێت، دەربڕینیش کۆمەڵێك وێنەو ڕوخساری هەیە ڕەنگە ئەو دەربڕینەش بە وشە یاخود بە جووڵاندنی دەست یان بەسەر ڕاوەشاندن یان بە ڕوخساری دەمو چاو ئەنجام بدرێت.

دەربڕینیش کارێك نییە تەنها تایبەتمەندبێت بە مرۆڤەوە، چونکە لە هەلو مەرجێکی دیاریکراودا گیاندارانی دیکەش بە هەمان شێوە دەتوانن پێویستیەکانی خۆیان لە ڕێگای کۆمەڵێك دەنگو جووڵەوە دەربڕن، ئەمانیش دەتوانن بە ڕێگەی هەندێك هاتو هاواری شێوە جیاواز جیاواز لە ڕووی توندیو بەرزی ئاوازەوە لە یەکتر بگەن، دەربڕینیش دوو شێوەی هەیە: یان دەربڕینی سروشتی یاخود دەربڕینی دانراو (وضعي) دەبێت.

٢. دەربڕینی سروشتی زمانی سۆزو کارتێکردنو هەست کردنە بە شێوە کاڵەکەی (فج)، ئەمیش لە کاتێکدا بووە کە هێشتا شارستانیەت بە کەیفی خۆی وشەی دانراوو دەربڕینی بۆ دانەهێناوەو هێشتا کۆمەڵگا قاڵبی وشەو شێوازی ڕستەی بۆ دروست نەکردووە، دەربڕینی سروشتی بە هاوارکردنو پێکەنینیو گریانو سوور هەڵگەڕانی دەمو چاوو روخساری خۆ نەویستی دیکە کە ئێمە بە ئەندامەکانی هەست کردنمان درکی پێدەکەین ئەنجام دەدرێت، جا لە ڕێگەی ئەم دەربڕینانەوە ئاگاداری حاڵی ئەو کەسە دەبین کە دووچاری ئێشو دڵتەنگیو



ترسو شتی دیکە بووە، دەتوانین هەست بەم جۆرە دەربڕینانە بکەین لەلای کەسێك کە هێشتا لەسەر سروشتی خۆی دەژێتو تێکەڵی خەڵکی نابێت.

ئەو کەسە شت دەبینێتو هەستی پێدەکات بەڵام هیچ ناوێکی بۆ دانانێت، بۆیە ئەم کەسە هیچ زمانێکی نابێت تەنها زمانی سروشتی نەبێت.

مرۆڤی شارستانیەتیش کاتێك تووشی ڕووداوێکی ناخۆش یان تێك چوونی مێشك دەبێت، ڕەنگە هەندێك لەو وشانەی کە لەناو کۆمەڵدا فێری بووە لە یاد بکات، چونکە بیرکردنەوەی تێکچووەو فریا ناکەوێت تاکو وشەی گونجاو لە شوێنی گونجاو بەکار بهێنێت.

### جۆری دانراو (الوضعي - الاصطلاحي)

ئەم زمانەش زمانی بیرکردنەوەی کارە ئاڵۆزەکانی مێشکەو لە هەمان کاتدا زمانی شارستانیەتو پێشکەوتنە، بەم زمانەیە کە خەڵکی لە ژیانیاندا لەگەڵ یەکدا هەڵسوکەوت دەکەنو لە یەك دەگەن بۆ جێبەجێ کردنی کاروباریان، ئەم زمانە لەوی دیکە بەوە جیا دەکرێتەوە کە ئەمیان خۆویستو مەبەست دارو تەنها بۆ

پێویستیەکانی مانەوە (البقاو) بەکار ناهێرێت، دەتوانین بە هۆی زمانی دانراوەوە مانای هەموو شتێك دەربڕین جا ئەوە پێویست بێت یان پێویست نەبێت، ماددی یان روحی بێت، بەرجەستە بێت یاخود رووت (مجرد) بێت.

### دوو جۆر دەربڕینی دانراو هەیە

– ئەوەی کە بە چاو دەبینرێت، وەکو هێمای دەریاکان (الاشارات البحریە)و جوولەی دەست کە کەڕولاڵەکن بۆ دەربڕینی هەستو نەستیان بەکاری دەهێنن، هەروەها ئەو وشانەی کە هاوکات لەگەڵ کرداری راڤە (شرح) کردن بەکار دەهێنرێت لەگەڵ نیشانە زمانیە نووسراوەکان.

– ئەوەی کە بە گوێ دەبیسترێت مەبەستمان دەنگە لێکدراوەکانو برگەو وشەو ڕستەیە، بەشی زۆری گیانداران هەروەکو ئادەمیزاد، یەکەم رێگا (زمانی زگماك بەکار دەهێنن بۆ دەربڕین، هەروەکو مرۆڤ، گیانداریش هەست بە برسێتیو تینوویەتیو تووڕەبوونو ترسو هەندێك هەڵچوونی دیکە دەکات.

لە هەر حاڵێك لەم حاڵانە گیانداریش تووشی ورووژاندن دەبێتو بە شێوەیەکی سروشتی وەڵامی ئەو ورووژاندنە دەداتەوە، وەکو چاو زاق کردنەوەو ددانە کیڕە (تکشیر)و



مووی لەش راوەستان. ئەم حاڵانە وای لێدەکەن کە هەندێك رەوشتی دیاری کراو بنوێنێت وەکو هەڵهاتنو دەڕندەییو خۆشاردنەوە.

هەر کەسێك سەرنج بداتە ئەم شێوە دەربڕینە ساکارانە تێدەگات کە ئەم شێوەیە لەگەڵ رەفتاری زماندا کە خەڵکی لەسەری رێك کەوتوون گەلێك دوورن، ئاژەڵ نە کۆئەندامێکی وای هەیە کە بتوانێت بە هۆیەوە دەنگی جیاواز جیاواز لە جێی – دەنگی (مخارج)ی تایبەتییەوە دەربڕێتو نە لە مێشکیدا شوێنی دیاریکراو هەیە تاکو دەست بگرێت بەسەر کردارە ئاڵۆزەکانی مێشکیدا.

کاتێك کە باسی زمانی مێشەنگ یان زمانی مەیموون یاخود زمانی هێماو زمانی ڕوخساری دەمو چاو دەکەین، وشەی زمان وەکو مەجاز بەکا دەهێنن واتا مەبەستمان ئاماژە بۆ کردنە بۆ یەکێك لەو ئامرازانەی کە بۆ دەربڕین بەکار دەهێنرێن نەوەکو بەو مانایەی زمان کە دەمانەوێت.

## فرمانی ڕاگەیاندن

مەبەستمان لە ڕاگەیاندن گواستنەوەی بیرە لە قسەکەرەوە بۆ گوێگر (زمان ئامرازی ڕاگەیاندن)ە، ڕێگایەکی زۆر هەیە بۆ ڕاگەیاندنی بیر یاخود گواستنەوەی، جا هەر چەندە ئەم ڕێگایانە لە یەکتری جیاوازن بەڵام هەموویان لەسەر پێنج کاری بنەڕەتی بەندن چونکە ئەو هەواڵەی کە بە تەمای ڕاگەیاندنین پێویستی بەم شتانەی خوارەوەیە:

أ. سەرچاوە (مصدر – Sourc).
ب. دوا قۆناغ (منتهی – Destination).
ج. کۆ ئەندامی ناردن (جهاز ارسال – Transmitter).
د. ڕێڕەو یان کەناڵ (ممر – Canal).
هـ. کۆ ئەندامی وەرگرتنەوە (جهاز التقاط – Respecter).

بەم شێوە هەمو هەواڵێك پێویستی بە سەرچاوەیەك و دوا قۆناغێکی و ڕێڕەوێك هەیە تاکو پێیدا بڕوات هەروەها پێویستی بە کۆئەندامێکی ناردن (ارسال) هەیە کە کاری



داڕشتنەوە بە چەند هێمایەکی زانراوەوە دەگرێتەوە ئەستۆی خۆی، لە دواییدا ئەو هەواڵە پێویستی بە کۆ ئەندامی وەرگرتنەوە هەیە بۆ وەرگرتنەوەی ئەو هێمایانەو وەرگێڕانەوەیان.

ڕاگەیاندن جۆری زۆری هەیە، ڕەنگە ئەو ڕاگەیاندنە بروسکە بێت یاخود دانان (تالیف) یان بە زمان بێت، ڕاگەیاندن بە زمان لە هەموو ڕێگاکانی دیکە بڵاوترەو لە نێوان خەڵکی زۆرتر بەکار دەهێنرێت چونکە زۆر جار سەرچاوەی هەواڵەکە ئادەمیزاد دەبێت، ئادەمیزاد بە هۆی پێکهاتە فیزیۆلۆژیەکەیەوەو لەگەڵ تاقیکردنەوە هەستی و عەقڵییەکانی ڕابردووی،دەتوانێت هەواڵی دەست کەوێت و بیگوێزێتەوە بۆ خەڵکی دیکەو بە هۆی ڕشتەی دەنگییەوە دەتوانێت هەواڵەکە بگۆڕێت بۆ چەند شەپۆلێکی دەنگی و ئەو شەپۆلانەش هەوا دەبڕن و دەگەنە گوێی خەڵکی دیکە (کۆئەندامی وەرگرتنەوە)، کۆ ئەندامی بیستنیش ئەو شەپۆلە دەنگیانە وەردەگرێتەوەو دەیگوێزێتەوە بۆ جووڵە، شەپۆلەکان بەناو دەمارەکان تێدەپەڕن تاکو دەگەنە کۆ ئەندامی دەماری ناوەندی (جهاز العصبي المرکزي).

**كرداى ڕاگەياندن دوو قۆناغى هەيە**

١. دارِشتن (الصياغة).

٢. ئاشكراكردنى دارِشتن (كشف الصياغة).

بۆ نموونە نووسين كارى دارِشتنەو خوێندنەوەش كارى ئاشكراكردنى ئەو نووسينەيە، قسە كردنيش كارى دارِشتنى ئەو بيرەيە كە لە ناو مێشكدا دەخولێتەوە، جا ئەو ئاخاوتنە يان بە هێماى عەرەبى يان بە ئينگليزى يان بە زمانێكى ديكە دەنووسرێتەوە، تێگەيشتنى بيستەريش كارى ئاشكرا كردنى ئەو هێمايانەيە، لێرەدا شايانى ئاماژە بۆ كردنە كە هەر چەندە ڕێگاكانى ڕاگەياندن جۆراو جۆر بێت ئەم ڕێگايانە چوون يەكن بۆ هەڵەكردن، سروشتى هەواڵ خۆى وايە كە بيستەر جارێ هيچى لێ نازانێت چونكە ئەگەر ئەو هەواڵە شتێكى زانراو بوايە لەلاى گوێگر، ئەو كاتە گواستنەوەى ئەو هەواڵە دەبووە كارێكى بێ سوود، ئەو هۆيانەى كە دەبنە ئەگەرى كەوتنە ناو هەڵەوە بريتين لە تێك چوونى ڕشتەى ناردن (جهاز الارسال) هەروەها بە فيڕۆچوونى هەندێك لەو هەواڵە كە بە ڕێگاى نێوان سەرچاوەى دەنگەكەو دوا قۆناغدا تێدەپەڕێت.



دەتوانين ناوى ئەو هۆكارانەى كە دەبنە هۆى دروست كردنى هەڵە لە كاتێ دەربڕيندا ناويان بنێين: تێك چوون يان دەنگە دەنگ يان هەراو هوريا كە بە پێى جياوازى شوێن دەگۆڕێت ئەمجا بە پێى ڕاى گشتى پێى دەوترێت تێكچوون (اضطراب)و بە پێى قسەى ئەمو ئەو پێى دەوترێت (وتى و وات)، لە كاتێكدا كە لە جێگەيەكى گشتيدا بمانەوێ گوێ لە ئاخاوتنێك بگرينو نەتوانين بە باشى لێى تێبگەين، هۆكارەكەى دەگەڕێتەوە بۆ بوونى دەنگە – دەنگ (الضجيج) بەڵام ئەگەر دەنگى ئێزگەيەكمان بە باشى بۆ نەبيسترا ئەوا دەڵێين هاژووهووژى (تشويش)ى لەسەرە.

## ئەرکەکانی دیکەی زمان

**گرنگترینیان:**

**١. لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە:**

زمان هۆکارێکی گرنگە بۆ کۆکردنەوەی زانستی مەردمو تاقی کردنەوەکانی نەتەوەکان لە شێوەی ئاخاوتندا بۆ ئەوەی خەڵك لێی تێبگاتو کۆمەڵێك خەڵکی دیکەش سوودی لێ وەرگرێتو کەلەپوورە کەلتوورییەکەشی پێ بنووسێتەوە، ئەمیش یارمەتی تاکەکاتی کۆمەڵ دەدات بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەفتاریان بە شێوەیەکی وا کە لەگەڵ کۆمەڵدا بگونجێت.

هەروەها زمان کۆمەڵێك دەستەواژە بەو تاکانە دەبەخشێت بۆ ئەوەی بتوانن لە شوێنی گونجاودا بەکاری بهێنن، بەم جۆرە کاتێك کە خەڵکی فێری زمانێك دەبێت ئەو زمانە لە بارودۆخێکی گونجاودا بەکار دەهێنێتو هەوڵ دەدات وەکو تاکێك ڕەفتارەکانی ملکەچی دابو نەریتی کۆمەڵەکەی بێت.

مامۆستا (ئەلبێرت) ئەرکەکانی زمانی کۆمەڵایەتی بەم شێوەیەی خوارەوە کورت دەکاتەوە:

أ. زمان نرخێکی کۆمەڵایەتی بە زانیاریو بیری



مرۆڤایەتی دەدات چونکە کۆمەڵ زمان بەکار دەهێنێت بۆ پیشاندانی زانیاریو هزرەکانی.

ب. چونکە زمان بە ئامرازێك دادەنرێت بۆ فێربوونی تاكو یارمەتی دەدات بۆ گونجاندنو ڕێکخستنی ڕەفتاری بە شێوەیەکی وەها کە گونجاو بێت لەگەڵ ڕەوشتی کۆمەڵەکەیدا.

ج. زمان کەلەپووری کەلتووریو ڕەوشتی کۆمەڵایەتی وەچە لە دوای وەچە دەپارێزێت.

د. بۆ بیرکردنەوە، زمان کۆمەڵێك ئامراز بە مەردم دەبەخشێت.

٢. لە ڕووی دەروونییەوە: زمان باشترین ئامرازی شیکارکردنو پێکەوەنانە کە بە هۆیەوە دەتوانین بۆ وردەکاری هەر ڕووداوێك یان هەر بیرێك لێکدانەوە بکەین، جا ئەگەر پرسیار لە کەسێك کرا دەربارەی ڕووداوێك کە خۆی بینیبێتی، ئەو کەسە دەستدەکات بە باس کردنی ئەو وردەکارییانەی کە پەیوەندی بەو ڕووداوەوە هەبووەو دەبینین چۆن وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە.

چی ڕوویدا؟ ڕووداوەکە بەسەر کێدا هات؟ کەی

روویدا؟ له کویێ؟ بۆچی؟و لەگەڵ ئەو رووداوە چی دیکه روویدا؟ زمان باشترین ئامراوە بۆ پیشاندانی وێنەی ئەو رووداوەی کە بینیویەتی، ئەم کارەش بە شیکارکردنی رووداوەکە بۆ پارچەکانی لەلایەن بینەرەوە ئەنجام دەدرێت، هەروەها زمان باشترین ئامرازە بۆ چەسپاندن و پێکەوەنانی ئەم وێنەیە لە مێشکی کوێگردا.

(سۆرندایك) وای بۆ دەچێت کە ئەرکی زمان لە روو دەروونییەوە بریتی نیە لە شیکارکردن و پێکەوەنان، بەڵکو زیاتر ئەرکی دروست کردنی وەڵامدانەوەیە لەلای تاکی کۆمەڵ. زمان وەکو ئامرازێك بەکار دەهێنرێت بۆ وروژاندنی بیرو سۆز لەلای خەڵکی دیکە، زمان دەکەوێتە ژێر یاسای وشیارکردنەوو وەڵامدانەوە هەروەها ئاشکرایە کە لە بواری زماندا، وشە بە ئاگادارکەرەوە دەژمێردرێت و وەڵامدانەوەش ئەنجامی رەفتاری زمانەوانیەکەی دەبێت.

٣. لە رووی بیرەوە: مرۆڤ لە گیاندارەکانی دیکە بەوە جیادەکرێتەوە کە توانای وێنا (تصور) کردن و داماڵین و شی کردنەوەو پێکەوەنانی هەیە، ئەگەرچی هەندێك گیانداریش زیرەکی و



بیرکردنەوەی تێدا بەدی دەکرێت، بەڵام ئەو گەشەکردنە گەورەیەی کە مرۆڤ بەدەستی هێناوە وای لێ دەکات کە بڕوا بهێنێت بەوەی کە جیاوازییەکی مەزن لە نێوان ئەم و گیاندارانی دیکەدا هەیە، بە گوێرەی ئاستی گەشەکردنی بیر، بۆیە تەنها بەراوردکردنی نێوان مرۆڤ و گیاندار بەشتێکی ڕاست نازانرێت مرۆڤ بایەخی کەمتر دەدات بە گیاندارانی دیکە چونکە گیاندار تەنها دەتوانێت لە ڕێگەی ڕوخساری دەرەوەی هەندێك شتمان بۆ ئاشکرا بکات ئەویش بە هۆی چەند غەریزەو تاقیکردنەوەی جیاوازە دەیبینین.

کاتێك تەماشای گیاندارێکی وەکو سەگ یان مەیمون دەکەین هەست دەکەین کە ئەو گیاندارە توانای قسەکردنی نیە، ئا لێرەوە دەچینە ناو کرۆکی باسەکەوە، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ بە تەنها لە ناو هەموو گیاندارانی دیکە، خاوەنی ڕشتەیەکە کە بە هۆیەوە دەتوانێت هزری خۆی بگەیەنێت بە خەڵکی دیکە، بۆیە هەرگیز نابێت هزرو زمان لە یەکتر جیا بکرێنەوە.

پێوەندی نێوان زمان و هزر پێوەندیەکی بەهێزە،

چونکە زمان پێناسەی ئامادەکراو پێشکەش بە هزر دەکات و وەسفی خەسڵەتەکانی هەموو شتێکی بۆ دەکات بۆ ئەوەی لەگەڵ شتی دیکەدا تێکەڵ نەبێت و یارمەتی خاوەن بیر دەدات لە کارەکانیدا چونکە هەندێك دارشتن و دەربڕین دەبەخشێت بەو کەسە، کۆمەڵێك شێوازی پێشتر زانراو دەخاتە ژێر دەستیەوە، هەر بەهەمان شێوە زمان بۆتە (قالب) بە بیر دەبەخشێت بۆ ئەوەی تێیدا بتوێتەوەو جێگیر بێت چونکە ئەگەر زمان نەبێت بیر ناتوانێت لە نێو شوێنە شاراوەکەیدا بێتە دەرێ.

### زارە ناوخۆییەکان (دیالێکت)و گەشەکردنی زمان

هەر زمانێك لە ژێر کاریگەی هۆکارێك یان زیاتر لەسەر پانتاییەکی گەورەی زەویدا بلاودەبێتەوەو ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی و هۆزی جیاواز جیاواز بەکاری دەهێنن، ئیدی مەحاڵە ئەو زمانە بتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ یەکێتی خۆی بپارێزێت، هەر ئەوەندەی پێ ناچێت ئەو زمانە لق و پۆپ دەهاوێژێت و زاری ناوخۆیی (دیالێکت)و لێ دەبێتەوەو هەر یەك لەو زارانە رێگەی گەشەکردن دەگرێتە بەرو تا جیاوازییەکی زۆر دەکەوێتە نێوانیانەوەو



هەر یەك لەو زارانەش لە هەندێك ڕووەوە دەبنە زمانێکی جیاوازو خاوەنی ئەو زمانەش پێی دەدوێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زمانانە لە هەندێك ڕووەوە یەك دەگرنەوە، هۆکاری سەرەکی لقی و پۆپ هاویشتنی زمان بۆ چەند زارێکی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ بلاوی بلاوبوونەوەی ئەو زمانە، هەر چەندە ئەم هۆکارەش هۆکارێکی راستەوخۆ نییە، بەڵکو ماوە دەدات بە پەیدابوونی چەند هۆکارێکی تری وەك:

١. هۆکاری کۆمەلایەتی – رامیاری: ئەم هۆکارانە دەگەڕێتەوە بۆ جودابوونەوەی ئەو ناوچانەی کە ئەو زمانەیان تێدا بلاوبۆتەوە.

٢. هۆکاری کۆمەلایەتی و دەروونی و ئەدەبی: ئەم هۆکارانەش بریتین لە جیاوازی نێوان دانیشتوانی ناوچە جیاجیاکان لە ڕووی سیستەمی کۆمەلایەتی و خووڕەوشت و کەلتوورو لایەنی بیرکردنەوەو ویژدان.

٣. هۆکاری جوگرافیایی: ئەم هۆکارەش بریتییە لە جیاوازی نێوان دانیشتوانی ناوچە جیاجیاکان لە ڕووی جیاوازی ئاوو هەواو سروشتی ولات و ژینگەو شێوەو شوێنی ولاتەکەیان، کە بە هۆی چیاو رووبارو دەریاچەکانەوە.. هتد، لێك جیادەبنەوە.

٤. هۆکاری ڕەگەزایەتی: ئەم هۆکارەش بریتییە لەو جیاوازییانەی کە دەکەوێتەنێوان دانیشتوانە جیاوازەکانی ئەو ناوچانەی کە لە ڕەگەزو ئەسڵ و فەسڵدا لێك جودان.

٥.هۆکاری لەشیی– فیزیۆلۆجی: ئەم هۆکارەش بریتییە لە جیاوازی نێوان پێکهاتەی سروشتی ئەندامەکانی ئاخافتن لەلای خەڵکی ناوچەکان.

ئەمەو دابەشبوونی ئەو خەڵکەی کە بە یەك زمان قسە دەکەن بۆ چەند کۆمەڵێکی جیاواز لە ژێر کاریگەری چەند هۆکارێك و جیاوازی ئەم کۆمەڵانە لە نێوان خۆیاندا لە ڕووی کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی و لایەنی ڕەگەزی و لەشیی و دەروونی و ئەو بارودۆخە سروشتی و جوگرافیایەی کە چوار دەوری داوە، دەبێتە هۆی ئاراستەکردنی زمانەکە بە ئاراستەیەکی جیاواز لەوانی دیکە.

هەروەها ئەم جیاوازیانەش نەخشەی گەشەکردنی ئەو زمانە دەکێشێت لە ڕووی دەنگ و مانا و شتی دیکەوە و بە پڕۆگرامێکی جیاوازو سەربەخۆ. جیاوازی نێوان ئەم دیالێکتانەش لە دوورەوە دەست پێ دەکات:

أ. ئەو لایەنەی کە پێوەندی بە دەنگەوە هەیە، جیاوازی



نێوان دەنگی ئەو پیتانەی (فونێمانەی) کە وشەیەکی لێ دروست دەبێت لە زارێکەوە بۆ زارێکی تر دەگۆڕێت، هەروەها شێوازی گۆکردنەکەش جیاوازی دەبێت.

ب. ئەو لایەنەی کە پێوەندی بە مانای وشەوە هەیە:لێرەشدا ئەوە تێبینی دەکرێت، کە مانای وشەیەك لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر دەگۆڕێت، بەلاّم ڕێزمانی تایبەتی ئەو زمانە لە هەر دوو ئاستی (مۆرفۆلۆژی و سینتاکسدا) کەمتر تووشی ئەو گۆڕانکارییە دەبێت، بۆ نموونە:

ئەو زارە ناوخۆییانەی (العامیە)، کە لە زمانی عەرەبییەوە پەلو پۆیان هاویشتووە لەهەر یەك لە وڵاتەکانی وەك (عێراق و شام و حیجازو یەمەن و میسرو.. هتد) لە زارە ناوخۆییەکانی ئەم وڵاتانەدا جیاوازییەکی زۆرکەم هەیە لە ڕووی سیستەمی دروستبوونی ڕستەو گۆڕانی بونیادی ڕستەو ڕێزمانی داتاشین و کۆکردن و بەمێکردن (التأنیث) و بچووکردنەوە، لە کاتێکدا ئەم جیاوازییە لە ڕووی هەر دوو (دەنگ) و (مانا)وە دەگاتە ڕادەیەك کە لە یەك نیمچە نامۆبن.

**بڵاوبوونەوەی زارە ناوخۆییەكان ( اللهجات المحلية )**

زمان بە بونەوەرێك دادەنرێت كە پێویستی بە گەشەكردن و تێكۆشانە بۆ ژیان،جاهەر كاتێك كۆمەڵگایەك ویستی بەندو سنووری لۆژیكی دەستكردی بۆ دابنێت، لە پێناو پاراستنی ئەسڵەكەی، ئەو كاتە هانی زمان دەدات تاكو یەكێك لەم دوو ڕێگایە دەگرێتە بەر: یان پەككەوتن و پیربوون و ئەمجا مردن، یاخود یاخی بوون و گوێپێنەدان و ئەمجا ژیان.

بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو كۆتانەدا رەنگە زمان پەنابەرێتە بەر خۆلەتكردن و (انشطار) لە ئەنجامیشدا زمانێكی دیكەی سەربەستی لێ بكەوێتەوەو دووربێت لە چنگی رێزمان و ئەوجا پێی دەوترێت زار (اللهجە) و لە ناو هەموو چینە جیاجیاكانی كۆمەڵدا خۆی دەنوێنێت، ئا لەسەر ئەم بناخەیەدا (زار) وەكو قەوارەیەكی زمانی لە پەراوێزی ئەو زمانە رەسمییە بەندكراوەی كە رێگای گەشەكردن و نوێ بوونەوەی پێ نادرێت پەیدا دەبێت.

ئەوەی زیاتر یارمەتی ئەم (زارە) بدات بۆ بڵاوبوونەوە لە ناو خەڵكیدا ئەوەیە كە بە جل و بەرگێكی تازەوە دەردەكەوێت وئەو پێویستیانەی كۆمەڵ دابین دەكات، كە



زمانە رەسمییەكە لە توانایدا نییە دابینی بكات، بۆ ئەم مەبەستەی ئەو (زارە – اللهجە) لەسەرتادا بە جۆرێك خۆی دەنوێنێ كە زۆر نزیكە لە زمانی دایكەوە، (واتا ئەو زمانەی كە لێی جودا بۆتەوە) ئەو دووركەوتنەوەیەش لە زمانی دایك دووركەوتنەوەیەكی تەواوی سەد لەسەد(مطلق) نییە،بەڵكو تا ڕادەیەك لە تێگەیشتندا هاوبەش دەبێت و جۆرە گەشە كردنێك لە ناو ئەو (زارە) ڕوودەدات و ئەوەش بۆ قسەكەر دابین دەكات كە بە ئاسانی پێی بدوێت، بێ شەرمەزاری و دەرچوونێك لە داب و نەریتی قسەكردن بەو زمانە.

زمانی عەرەبی زمانێكی پیرۆزە بە هۆی پێوەندی ئەم زمانە بە ئاینی ئیسلامەوە، چونكە زمانی قورئانی پیرۆزو مووسڵمان و عەرەبیش هەوڵی ئەوەیان داوە ئەو زارە بەو شێوەیە بهێڵنەوە كە قورئانی پیرۆزی پێ ڕەوانە كراوە بۆ پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەمیش هۆكارێك بووە بۆ ئەوەی زارەكانی دیكەی ئەو زمانە نەتوانن زمانی نوێ لەسەر حیسابی زمانی دایك دروست بكەن.

پاش ملكەچ كردنێكی نەرم و نیان بۆ یاساو دەستوورەكانی زمانی دایك زارە ناوخۆییەكان دەتوانن

بچنە نێو زمانە رەسمییەکەوە، زمانی عەرەبیش دەتوانێت خۆی دەوڵەمەندو فراوان بکات بە توانای زارە ناوخۆییەکان‌و وەرگرتنی گەلێك وشەی پەتی‌و ڕەوان بێ شێواندنی زمانی رەسمی‌و زاری ناوخۆ، (الازدواجیە اللغویە) هیچ گومان لەوەدا نییە کە (زارە) ناوخۆییەکان لەسەر هەر دوو ئاستی هەرێمی‌و کۆمەڵایەتی کاریان بۆ نۆژەنکردنەوەی زمانی پاراوکردووە، ئەمڕۆش زمانی عەرەبی پاراو بووە بە زمانی رۆژنامەگەری‌و راگەیاندن‌و ڕۆمان‌و چیرۆك، کە هەموو چینەکانی کۆمەڵ لێی تێدەگەن، لە پێناو ئەم نزیکبوونەوەیەندا زارەکان وازیان لە هەندێك خوارو خێچی خۆیان هێناوەو هەروەها زمانە پاراوەکەش بەرانبەر بەو کارە وازی لە شتە نامۆکان‌و هەندێك رێبازی خۆی هێناوە.

ئەمەو لە پێناوی هێشتنەوەی پێوەندیی هاریکاییی لە نێوان زارە ناوخۆییەکان‌و زمانە پاراوەکەدا، پێویستە جڵەوی زارە ناوخۆییەکان بەر نەدرێت، بۆ ئەوەی کۆمەڵگە لە زمانی دایك دوور نەخاتەوە، هەروەها نابێت بە زمانی سەرکوتکردن مامەڵە لەگەڵ زارەکاندا بکرێت، کە ئەمیش لەگەڵ یاسای مێژوودا ناگونجێت، بەڵکو پێویستە پیاوانی بیرو پەروەردەی رۆشنبیری کار بکەن بۆ تەسك



کردنەوەی بۆشایی نێوان زمانی پاراوو زارەکان لە پێناو بە دیهێنانی زمانێکی مامناوەندی، پێویستە ئەو زمانە مامناوەندییەش نەبێت بە هۆی خنکاندنی زمانە پەتیەکە (الفصحی)و نەبێت بە هۆی دوور خستنەوەی نێوان زمانەکەو یاساکانی، هەروەها نابێت رێگە لە یاسای نۆژەنکردنەوەی زمان (قانون التجدید اللغوی) بگیرێت، کە هەندێك جار ئەم نۆژەنکردنەوەیە بە رێگەی زارە ناوخۆییەکان یاخود بە هۆی گەشەکردنی خودی زمانە پەتییەکەوە دەردەبڕدرێت.

## چەند توێژینەوەیەك سەبارەت بە زمان

مرۆڤ سەبارەت بە زمان‌و ئارەزووی لێکۆڵینەوەی، کۆمەڵێك پرسیاری وورووژاندووەو ئەم پرسیارەی لە خۆ کردووە، ئایا بۆچی لە زمان دەکۆڵینەوە؟ حەزو ئارەزوویەکی بێ کۆتایی لە ناخی مرۆڤدا هەیە بۆ درك پێکردن‌و زانینی راستیی هەموو شتێك، ئەمیش بووە بە هۆی دروستبوونی ئارەزوویەکی بە هێز بۆ زانینی هۆی هەموو شتێك، هەر ئەم ئارەزووەشە کە هانی دەدات بۆ لێکۆڵینەوەی زمان، ئەوەی دەربارەی مرۆڤ زانرابێت ئەوەیە کە مەیل‌و ئارەزوویەکی زۆری هەیە بۆ لێکۆڵینەوەو

ئاشكرا كردن، بە تایبەتی ئەو دیاردە شاراوانەی كە ڕۆڵ‌و كاریگەرییەكی گەورەی بەسەر ژیانیدا هەبووە، زمانیش وەك دیاردەیەكی شاراوە وەسف كراوە، بۆیە هەر لە كۆنەوە مرۆڤی هانداوە وەك دیاردەیەك لە زمان بكۆڵێتەوە.

مێژوو ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە یەكێك لە فیرعەونەكانی میسر، هەوڵی داوە بۆ زانینی پەیدابوونی یەكەم زمان لەم بوونەوەرەدا، بۆ ئەم مەبەستەش هەستاوە بە دابڕینی (عزل) دوو منداڵ لە نێو كۆمەڵگاكەیدا، پاش ماوەیەك ئەو دوو منداڵە بانگ دەكاتە نێو دیوەخانەكەی (مجلس)و هەوڵی دواندنیانی دەدات بۆ ئەوەی بزانێت چی دەردەبڕن‌و قسەی چی دەكەن، لە ئەنجامدا یەكێك لە منداڵەكان وشەیەكی نا میسری (غير مصري) دركاند، كە بە مانای (نان – خبز)ی (زمانی ئارامی) دەچوو، دوای ئەم تاقیكردنەوەیە (فیرعەون) زمانی ئارامی بە یەكەم زمانی سەر ڕووی زەوی دانا، لە ڕێگەی ئەم چیرۆكە مێژووییەدا ئەومان بۆ دەردەكەوێت كە مرۆڤ ئارەزوویەكی زۆر كۆنی تێدایە بۆ زانینی نهێنی گرنگترین دیاردەكانی ژیان كە ئەویش زمانە.

هەمو كۆمەڵگایەك خەمخۆری پەروەردەكردنی تاكەكانێتی، هەوڵی ئەوە دەدات بە باشترین شێوە پەروەدە



بكرێت‌و ماف ئەوە دەدات بە تاكەكانی بۆ ئەوەی بە چاكترین شێوە فێری زمانەكە ببن هەروەها دەبێت ئەوەش ڕەچاو بكرێت، كە كۆمەڵە كەسێك لە ناو كۆمەڵدا دەبن كە بێبەش لە توانای قسەكردن، ئەویش بە هۆی بوونی هەندێك تەگەرەوە، كە ڕێگا دەگرێت لە توانای قسەكردنی تاكەكانی كۆمەڵ، بوونی ئەم تەگەرانەش هۆیەك بوون بۆ پەیدا بوونی لێكۆڵینەوەی زمانی، پێوەندی نێوان ئەو تەگەرانەو زمان لەم خاڵانەدایە:

– بە هۆی ڕووداوێك یان نەخۆشییەكی لەناكاو، كە تووشی ئەندامەكانی ئاخافتن دەبن، وەكو (زمان، ددان، هەردوو بۆشایی نێو دەم‌و لووت) كە ئەمیش كاردەكاتە سەر زمان‌و چاك بەكارنەهێنانی.

– ئەو نەخۆشییە دەروونیانەی كە تووشی مەردم دەبێت، وەك: نەخۆشی (شیزوفرینیا) كە تووشبوو مەیلێكی زۆری دەبێت بۆ بەكارهێنانی هەندێك وشەو پشتگوێ خستن یان وازهێنان لە هەندێك وشەی تر كە پێویست بە وتنەوە ناكات لە كاتی قسەكردندا.

## شێواوی زگماکی ( سروشتی ) لە زماندا

— ئەو نەخۆشییانەی کە تووشی ئەو بەشەی مێشك دەبێت کە پێوەندی بە زمانەوە هەیە.

ئەرکی زمان ڕۆڵێکی گرنگ‌و دیار دەگێڕێت لە هاندانی مرۆڤ بۆ لێکۆڵینەوەی زمان، چونکە زمان ئامرازی پێوەندی کردنە لە نێو مرۆڤدا، بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم ئەرکە گرنگەی زمان کۆمەڵێك توێژینەوە ئەنجام دراوە کە شوێنەوارەکەی لە گەلێك روخساردا رەنگ دەداتەوە وەکو پێوەندی تەلدارو بێ تەل‌و کۆمپیوتەرو ڕادیۆوتەلەفزیۆن.

گرنگترین ئامانجەکانی زمان گەیشتنە بە چەند یاسایەك کە بە هۆیەوە بتوانرێت بە رێك‌و پێکی دەنگی فۆنێمەکان (فۆنێم: بچووکترین دانەی بێ واتای زمانەو نرخێکی هەیە لە زماندا.. وەرگێرەکان) بناسرێتەوەو رێکبخرێت لە چەند پێکهانەیەکی زمانی (مانا)و (دەنگ) پێکەوە ببەستێتەوە، واتا ئاشکراکردنی ئەو یاسایانەی کە دەبێت زمان لە هەموو روویەکەوە پێڕەویان بکات‌و ملکەچی یاسا جیاجیاکانی بێت.



## جۆرەکانی لێکۆڵینەوەی زمانی

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە سەبارەت بە زمان کراون زۆر و جۆراو جۆرن، ئەگەر لەو لێکۆڵینەوانە وردبینەوە دەبینین کە ئەمانە بە زۆری باس لەم بابەتانەی خوارەوە دەکەن:

١. هەندێك لەو لێکۆڵینەوانەی کە پێوەندییان بە سەرهەڵدانی زمانی مرۆڤەوە هەیە، بە چڕوپڕی باسی ئەو شێوە سەرەتایە دەکات کە بۆ یەکەم جار مرۆڤ شتی پێ دەربڕیوەو هەروەها باسی ئەم گەشەکرنە دەکات کە لەم بوارەدا روویداوەو بووە بە هۆی شێوە دەربڕینێك کە مانای ئاشکراو ڕوون ببەخشێت.

٢. هەندێك لەو لێکۆڵینەوانەی کە باسی ژیانی زمان‌و ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە قۆناغەکانی گەشەکردن‌و پەرەسەندندا، چ لەلایەن دەوڵەمەندی‌و هەژاری بە سەریدا دێت.

٣. هەندێك لەو لێکۆڵینەوانەی پێوەندییان بە بنەمای (أصول) وشەوە هەیە.

٤. هەندێك لەو لێکۆڵینەوانەی کەپێوەندییان بە (واتا)وە هەیە، وەکو مانای وشەو شێوازی داتاشینی وشە.

٥. هەندێك لەو لێکۆڵینەوانەی پێوەندییان بە دەنگ‌و

ڕشتەی دەنگو ڕێگای بەرهەمهێنانی دەنگەوە هەیە.

٦. هەندێك لەو لێكۆڵینەوانەی پێوەندییان بە لایەنی كۆمەڵایەتییەوە هەیە، واتا گەڕان بە دوای پێوەندی نێوان زمانو ژیانی كۆمەڵایەتی هەروەها كاریگەری كۆمەڵگاو شارستانیەتەكەی.

٧. ئەو لێكۆڵینەوانەی كە پێوەندییان بە لایەتی دەروونییەوە هەیە، واتا ئەو لێكۆڵینەوانە پێوەندییان بە دیاردەی زمانەوانیو دیاردەكانی دەروونییەوە هەبێت، وەك: بیركردنەوەو خەیاڵو بیرهاتنەوەو ویژدان.

## جیاوازی تاكەكەسیی لە فێربوونی زماندا

ڕەفتاری بەكارهێنانی زمان بە نیشانەیەكی جیاكەرەوەی مرۆڤ دادەنرێت، زمان چاكترین ئامرازە بۆ ناسینەوەی كەسایەتی مرۆڤ، هەر چەندە بۆ ناسینەوەی مرۆڤ گەلێك ڕێگا هەیە بەڵام زمان بە باشترین ڕێگا دادەنرێت، هەر تاكێكی كۆمەڵ ڕێبازێكی تایبەتی خۆی هەیە بۆ داڕشتنو تاكەكانیش یەكسان نین لە رووی زەخیرەی زمانیەوە هەر وەك دەبینرێت كە هەندێك كەس وشەی جۆراو جۆر بەكار دەهێننو هەوڵدەدەن وشەكان كەمتر دووبارە بكەنەوە.



لێكۆڵینەوەكان لەوە دڵنیایان كردووین كە ئەو تەمەنەی منداڵ تێیدا دەست دەكات بە زمان گرتن لەلای هەموو منداڵان چوون یەكەو لە كەلتوورێكەوە بۆ كەلتوورێكی تر ناگۆڕێت، بەڵام توانای گەشەكردنی زمانی لە نێوانی منداڵانی هاو تەمەن جیاوازە، بوونی ئەم جیاوازیەش دەبێتە هۆیەك بۆ وروژاندنی كۆمەڵێك پرسیار، لە وەڵامی ئەم پرسیارانەشدا دەگوترێت كە هەندێك جیاوازی تاكەكەسیی (فروق فردیة) لە نێوان منداڵان دا هەیەو هۆكارەكانیشی بۆ ئەم خاڵانە دەگەڕێتەوە:

١. هۆكاری كار ئەندام زانی (الفسیولوجیة): مەبەست لە سەلامەتی كۆئەندامی دەمار (الجهاز العصبي)و سەلامەتی كۆئەندامی ئاخافتنو گۆكردنو سەلامەتی هەردوو هەستی بیستنو بینینە (السمع والبصر) چونكە ئەمانە هەموو كاری پێویستو گرنگن بۆ گەشەكردنی زمان.

٢. ناڕێكی هەڵچوونو ناڕێكی كۆمەڵایەتی ڕۆڵێكی خراپ دەگێڕن لە گەشەكردنی زمانیدا، بە پێچەوانەشەوە باروودۆخێكی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی دەبن بە هۆكاری چاك بۆ گەشەكردنی زمانی منداڵ.

٣. پێوەندی نێوان زارۆكو داكی: ئەگەر ئەم پێوەندیە بە

شێوەیەکی ڕاستو دروست بێت ئەوا دەبێتە هۆی گەشەکردنی زمان بە شێوەیەکی دروست، بەڵام ئەگەر ئەو پێوەندیە خراپ بوو لە نێوان زارۆکو دایك ئەوا دەبێتە هۆی ڕەنگدانەوەیەکی خراپ لەسەر گەشەکردنی زمانی منداڵ.

٤. بێبەش کردن (الحرمان) ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕێت لە خوڵقاندنی جیاوازی زمانیی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا.

٥. پێوەندیو هەڵسو کەوتی کۆمەڵایەتی لەبار لە نێوان منداڵو ئەو کەسەی کە پەروەردەی دەکات ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لە پەرەپێدانو گەشەکردنی زمانی منداڵ.

٦. میدیاکانی ڕاگەیاندن، وەکو ڕادیۆ، تەلەفزیۆن.. هتد، کاری زۆر دەکەنە سەر زمان گرتنی منداڵ.

٧. لێکلۆڵینەوەکان سەلماندویانە کە منداڵانی دامو دەزگاکانو پەناگاکان (الملاجئ) هەژارتر دەبن لەو منداڵانەی کە باوەشی کەسو کاریان پەروەردە دەکرێت.

٨. لێکۆڵینەوەکان سەلماندویانە کە زمانی منداڵی تاقانە باشتر گەشە دەکات لە چاو ئەو منداڵانەی کە ژمارەیان



زۆرەو لەناو یەك خێزاندا پێکەوە دەژین، منداڵی تاقانە مەودایەکی زۆرتری دەبێت بۆ هەڵسو کەوت کردن لەگەڵ گەورەدا.

٩. زمانی منداڵانی چینی بەرزەکانی کۆمەڵ دەوڵەمەندتر دەبێت لە چاو زمانی ئەو منداڵانەی کە لە چینی خوارووتری کۆمەڵدا دەژین.

١٠. جیاوازی ژینگە (البیئە) هۆکارێکی دیکەیە بۆ کەمو زۆری فێربوونی زمانی منداڵ، ئەمیش لەوە تێبینی کراوە کە منداڵی لادێ جیاوازە لە منداڵی ناو شار لە ڕووی زمانەوە، هۆکاری ئەو دووجیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی نێوان ئەم دوو ژینگەیە.

١١. توخم (الجنس) بە پێی توێژینەوەکان دەرکەوتووە کە جیاوازی هەیە لە نێوان هەردوو توخمی نێرو مێ لە ڕووی گەشەکردنی زمانەوە، توخمی مێینە زیاتر گەشەدەکات لە قۆناغە سەرەتاییەکانی تەمەنیدا، بەڵام ئەم جیاوازیە لە پاش تەمەنی شەش ساڵی وردە وردە کەم دەکاتەوە تا دەگاتە شێوەیەك لە هاوسەنگیو لێکچون (التماثل)، لە نێوان هەردوو توخمەکەدا بە مەرجێك هیچ کەمو کوڕیەك لە ئەندامەکانی ئاخافتنیاندا نەبێت.

١٢. هۆکاری کەلتووری: ڕەخساندنی کەش و هەوایەکی چاك لە نێوان خێزاندا یارمەتی منداڵ دەدات بۆ گەشەپێدانی زمانەکەی، ئاشکرایە منداڵی خێزانە رۆشنبیرەکان زیاتر فێری زمان دەبن لە چاو منداڵانی ئەو خێزانانەی کە ئاست رۆشنبیریان نزمترە،

١٣. زیرەکی: تۆیژینەوەکان دەریان خستووە کە زیرەکی شوێنەوارێکی دیاری هەیە لە کرداری زمان فێربوون دا، هەموو کەم و زۆریەك لە زیرەکیدا هۆکارێکە بۆ جیاوازی ئاستی زمان فێربوون لە نێوان منداڵاندا، چونکە پێوەندی نێوان زمان و زیرەکی پێوەندیەکی ئاڵوگۆڕە.

١٤. تەندروستی گشتی منداڵ ڕۆڵ دەگێڕێت لە بڕی فێربوونی زمان و زاڵ بوون بە سەریدا، ئەم تەندروستیەش هەردوو بواری دەروونی و لەشی دەگرێتەوە.



## گەیاندنی زمان

### پێوەندییە نازمانیەکان (التواصل غیر اللغوی)

خەڵکی بۆ پێوەندی کردن بە یەکەوە ڕێگای جۆراو جۆر دەگرنە بەر، وەکو زمانی ڕێکخراوو زمانی نوسراو کە بە باشترین و گرنگترین شێوە دادەنرێت و مرۆڤ بە هۆیەوە دەتوانێت زانیاریەکانی بۆ خەڵکی دیکە بگۆزێتەوە ئەویش بە ڕێگای جوڵەو هەڵس و کەوتەوە، هەروەها بەکارهێنانی وێنەش شێوەیەکە لە شێوەکانی پێوەندی کردن.

پێوەندی بریتییە لە کرداری گواستنەوەی واتا لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر لە ڕێگای کۆدەوە (رمز) بەم شێوەیە پێوەندی دەبێتە کردارێکی زەینی – فیزکی، ئەرکی ئەم کۆدەش بریتییە لە ڕوون کردنەوەی مانای مەبەست (المعنی المقصود) گەیاندن.

پێوەندی کردن بە یەکی لە گرنگترین ئەرکەکانی زمان دادەنرێت، هەر بە هۆی پێوەندیەوەیە کە هەواڵێك لە خاڵێکەوە بە خاڵێکی دیکە دەگوێزرێتەوە، زۆر شتێکی ئاساییە ئەگەر پێوەندی واتایەکی بەرفراوانتری هەبێت لە چاو زمان، چونکە ڕێگای زۆر هەیە بۆ گواستنەوەی واتا

یان هزر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، وەکو ڕێگای دەنگو نووسینو هێما کردن بە دەست یان هەژاندنی سەریانو بەکارهێنانی هەندێك هێمای تایبەت هەر لەبەر ئەمەیە کە زمان بە ڕێگەیەك لە ڕێگاکانی گەیاندن دادەنرێت.

هەر چەندە ڕێگاکانی پێوەندی کردن جیاوازو جۆراو جۆرن، بەڵام هەموویان لەسەر ئەم پێنج خاڵە بنەڕەتیانەی خوارەوە بەندن:

١. سەرچاوە – المصدر: کە هێمای دەربڕینی وەکو زمانو جوڵە لێوە دەردەچێت.

٢. نێرەر – المرسل: ئەو ئامێرەیە کە ئەرکی ناردنی هێمای دەربڕین دەگرێتەوە ئەستۆ.

٣. کەناڵ – القناە: بریتییە لەو ڕێچکەیەی یان ئەو ڕێگەیەی کە هێمای دەربڕین دەیگرێتە بەر، لە کاتی ئاخافتندا (با – الهواء) بەو ڕێچکەیە دادەنرێت بۆ ئەوەی شەپۆلەکانی دەنگی پێیدا بگوێزرێتەوە.

٤. وەرگر – المستقبل: ئەمیش بریتییە لەو کۆ ئەندامەی کە هێمای دەربرین لە دوا قۆناغی دا پێی دەگات، وەکو گوێی مرۆڤ لە کاتی بوونی دەنگ دا بە کۆئەندامی وەرگرتن دادەنرێت.



٥. ئامانج – المرمی: ئەو هێزە عەقلییەیە کە وەڵامی ئامێری گەیاندن دەداتەوەو ئەمجا هێما دەربڕینەکە وەردەگرێتو درکی پێدەکاتو پاشان هەڵوێستێکی دیاری کراوی لێ وەردەگرێت.

## گرداری گەیاندن دوو قۆناغ دەگرێتەوە

١. قۆناغی داڕشتن.

٢. قۆناغی ئاشکرا کردنی ئەو داڕشتنە یان وەرگێڕانی.

بە کورتی هەر زمانێك بریتییە لە کۆمەڵێك هێماو نیشانە کە پێشتر لەسەری ڕێککەوتوون، بۆ نموونە نووسین کرداری داڕشتنەو خوێندنەوە ئاشکراکردنی ئەو داڕشتنەیەو ئاخافتنیش کرداری داڕشتنی ئەو هزرانەیە کە لە مێشکدا خول دەخۆنەوەو تێکەیشتنی گوێگریش لەو داڕشتنە خۆی لە خۆی دا وەکو کرداری ئاشکرا کردنی ئەو ڕەمزانەیە.

**جۆرەکانی گەیاندن ( أنواع التواصل )**

دەتوانین دوو جۆرە گەیاندن دیاری بکەین:

١. گەیاندنی زمانی (التواصل اللغوی).

ئەو گەیاندنەیە کە زمان بە هەموو هێما و دەنگەکانییەوە وەکو ئامێرێك بەکار بهێرێت.

٢. گەیاندنی نازمانی (تواصل غیر لغوي):

ئەمیش بە هۆی کۆمەڵێك ئامرازی جۆراو جۆرەوە ئەنجام دەدرێت وەکو:

أ. گەیاندن بە هۆی جەمو جۆڵەوە (الحرکات) وەکو سەمای دەربڕین (الرقص التعبیري).

ب. گەیاندن بە هۆی کارو کردارەوە بۆ نموونە کەسێك دەست لە ملی کەسێکی دیکە بکات بۆ دەربڕینی خۆشەویستی.

ج. گەیاندن بە هۆی هەندێك وێنەی بێ جوڵەو جوڵەدارەوە وەکو ئەوەی هونەرمەندێکی شێوەکار هەڵسێت بە هۆی وێنەوە گوزارش بکات لە ڕووی ناشیرینیو وێرانکاریی جەنگ.

د. گەیاندنێك کە پێوەرەکان بە ڕێگای لاسایی کردنەوە وەرگرێت وەکو ئەوەی کەسێك هەڵسێت جلو بەرگێکی



سەیرو نامۆ لەبەر بکات بۆ ئەوەی پیشانی خەڵکی بدات کە ئەو لە دابو نەریتی ئەوان دابڕاوە.

هـ. گەیاندن بە دەنگی نابڕگەیی وەکو هەناسە هەڵکێشان لە کاتی ناڕەزایی دەربڕین.

و. گەیاندن بە هۆی چەند دەنگو ئاوازێکی جیاواز.

ز. گەیاندنێك بە هۆی کە پێویستی بە هەڵوێستەیەکی ڕێزمانی هەبێت وەکو هەڵوەستیەکی بە ئەنقەست لە کاتی خوێندنەوەدا بۆ سەرنج راکێشانی گوێگر بۆ ئەوەی بیر لەو ڕستە خوێندراوە بکاتەوە.

## یەکەی دووەم






## تیۆرەکانی زمان گرتن

گومان لەوەدا نییە کە زمان گرتن لە ڕێگەی فێربوونەوە دەبێت نەك لە ڕێگەی زگماکەوە، ئەگەر زمان گرتنی مرۆڤ کارێکی زگماك بایە، ئەو هەموو زمانانە لە جیهاندا پەیدا نەدەبوون زۆربەی توێژینەوەکان ئەوە دەردەخەن کە قۆناغەکانی گەشەکردنی ڕەفتاری زمانی لەلای هەموو منداڵانی جیهان چوون یەکە.

هەروەها توێژینەودەکات جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە گەشەکردنی زمانی منداڵ بەندە لەسەر دوو مەرجی بنەڕەتی:

١. پێکەیشتنی هەندێك لە کۆئەندامی ئرۆگانیو دەمارەشانەو ماسولکەکانی.

٢. لە کاتی پێکەیشتنی ئەندامەکانی ئاخافتن، لە ڕێگەی فێربوونەوە مەشقیان پێ بکرێت.

زانا ناتەبان لەسەر شرۆڤەکردنی چۆنیەتی زمان فێربوونی منداڵ، ئەم زاناو لێکۆڵەرانە سەرسامن بەرامبەر ئەو بنەمایانەی کە فێربوونی زمانی لەسەر رادەوەستێت بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ ئەم مەسەلەیە تیۆرە دەروونیەکان هاتنە کایەوە، ئێمەش

لێرەدا هەوڵ دەدەین هەندێك باسی ئەو تێورە دەروونیانە بکەین بۆ ئەوەی بیرو بۆچوونی هەر یەکەیان بخەینە ڕوو تاکو بزانین فێربوونو دروست بوون زمان لەلای مرۆڤ چۆن دەبێت.

### گرنگترین تێورەکانیش ئەمانەی خوارەوەن

**١. تێوری لاسایی کردنەوە:**

لاسایی کردنەوە بە دیاردەیەکی سروشتیو گشتی دادەنرێتو مانای وەرگرتن دەبەخشێت، بە هەمان شێوە مانای بزاڤ و جمو جوڵی زمانی دەگرێتە خۆی. لاسایی کردنەوە ڕۆڵێکی دیار دەگێڕێت لە کرداری وەرگرتنی زمانو بە هێزتر کردنی زمانیو زیادکردنی وشەو مانای وشە لەلای منداڵ، کە منداڵ لە دایك دەبێت، بە شێوەیەکی زگماکی ئامادەباشی تیا دەبێت بۆ قسەکردن، بەڵام ڕێگەی ئەم زمان گرتنە بە شێوەیەکی وەرگیراو (مکتسب) دەبێت، هەندێك لە لایەنگرانی ئەم تێورە وای دادەنێن کە لاسایی کردنەوە لە دواچارەکی ساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵەوە دەست پێ دەکاتو بەردەوام دەبێت تاکو سەرەتاکانی ساڵی چوارەم، بەڵام هەندێکی دیکە لەو



خاوەن تێورانە دەڵێن لاسایی کردنەوە لە دوای تەمەنی نۆ مانگیەوە دەست پێدەکات.

لاسایی کردنەوەی منداڵ بەندە لەسەر ئەو دەنگانەی کە منداڵ گوێ بیستیان دەبێت لە دەوروبەری خۆیو ئەما منداڵەکە دەست دەکات بە گۆڕینی ئەو دەنگانە بۆ هەندێك دەنگی تایبەتی، ئەگەر منداڵەکە توانای ئەم کارەی هەبوو ئەوا لاسایی دەکاتەوە ئەگینا دەنگەکان لە مێشکی خۆیدا دەهێڵێتەوە تاکو ئەو کاتەی توانای وتنەوەیانی دەبێت، توێژینەوە دەروونیەکان ئاماژە بۆ گرنگیی ڕۆڵی خێزانو کۆمەڵ دەکەن وەکو چەند فاکتەرێکی کاریگەر لە کرداری زمان وەرگتن دا، نێو خێزان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕشێت لە کرداری گەشەکردنی زمانو زمان وەرگرتن، چونکە منداڵ پشت ئەستوری ئەو شتانە دەبێت کە لە دەورو بەری دا دەبن، هەتاکو دەرکەوتنی کەسایەتی خۆی، منداڵ زۆربەی شتەکان لە خێزانەوە فێر دەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت لێیان تێبگاتو هەڵسو کەوتیان لەگەڵ دا بکات. زمان ئامرازێکی گرنگە بۆ وەرگرتنی ئەم جۆرە کەسایەتیەو پەرەپێدانی لەسەرەتا منداڵ زمانی لە دایکیەوە وەردەگرێت

چونکه لەو تەمەنەدا زۆر نزیك لە دایکیەوەو لێی دانابڕێت.

بەڵام ئەم تێورە ناتوانێت ئەو هۆیانە دەربخات کەوا لە منداڵ دەکات لاسایی دایكو باوکی بکاتەوە کەچی ئاماژە بۆ ئەو میکانیزمە دەروونی و بایەلۆژیانە دەکات کە کار دەکەنە سەر کرداری زمان وەرگرتنی منداڵ لە ڕێگەی لاسایی کردنەوەوە.

**٢. تێوری فێربوونی چۆنێتی مەرجی:**

ئەم تێورە دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی رەفتاری. تێورەکە وای بۆ دەچێت کە منداڵ لەسەرەتادا لە خۆڕا هەندێك دەنگی رەمەکی دەردەبڕێتو باوكو دایکیشی هانی دەدەن بۆ ئەم جۆرە رەفتارە، ئەویش بە چەند شێوازێکی جیاواز وەکو زەردەخەنەو یاری لەگەڵ دا کردنو لە ئامێزگرتنی، ئا لەم ڕێگەوە منداڵ هەست بە تاوانی خۆی دەکات بۆ قسەکردنو خۆی خۆی بە هێز دەکات.

بەم جۆرە ئەو دەنگای دەری دەبڕێت وەکو ئەو کەرەسە سەرەتاییانەی لیَ دێت کە زمانی لەسەر بنیاد دەنرێت.



کاتێك ئەم تێورە باسی زمان وەرگرتن (اکتساب) دەکات جەختێکی زۆر دەکاتە سەر رۆڵی هاندان، بۆ نمونە کاتیك کە منداڵ پاداشتو پێزانینی دایكو باوکی دەست دەکەوێت لە ئەنجامی ئەو دەنگە کە دەری دەبڕێت دایكو باوکشی لاسایی دەکەنەوە، ئەمە دەبێتە هاندەرێك بۆ ئەوەی ئەو منداڵە بە شێوەیەکی بەردەوامو دروست تر دەنگەکان دووبتارە بکاتەوە.

بۆ نمونە ئەگەر منداڵ هەندیك دەنگی دربڕیو دایكو باوکی لاساییان کردەوە ئەم کارە خۆی لە خۆی دا دەبێتە پاڵنەرو پاداشتێك بۆ ئەو منداڵە تاکو بە شێوەیەکی بەردەوام هەستێت بە دووبارە کردنەوەی ئەو دەنگانەو چاکتر وتنەوەیان.

هەروەها ئەم تێورە وادەبینێت کە هاندەری لاوەکی (التعزیز الثانوي) رۆڵێکی گرنگو دیار دەگێرێت لە پێشڤە بردنو گەشەپێدانی زمان، چونکە ئاخافتنی دایك پەیوەستە لەگەڵ کرداری شیردانو پاك کردنەوەیو گۆڕینی جلو بەرگو یاری کردن لەگەڵ منداڵەکەی، بۆیە لێرەوا ئاخافتنو دەنگی دایك دەبنە هاندەری لاوەکی بۆ ئەو منداڵە.

هەروەها ئەم تیۆرە وادەبینێت کە وەڵام دانەوە ئاخافتنیەکان (الاستجابە الکلامیە) لە ئەنجانی هەست پێکردنێکی دیاری کراودا پەیدا دەبن، تەنها پەیوەستن بە هاندەرەوە (حافز) پێوەندیەکی ئەوتۆی نییە بە شێوازی هزرکردنەوەو دەست تێوەردانی هزرو یاسا ڕێزمانییەکانەوە، ئەم تیۆرە وایە کە ئەنجامی رەفتاری زمانی بەرهەمی پرۆسێسی پشتگیریی (تدعیم) کردنە.

بە بیرو بۆچونی (سکنەر) زمان شێوەیەك لە شێوەکانی رەفتاری گشتی (السلوك العام) وروژێنەرە دەنگیو بایەلۆژییەکان کاردەکەن بۆ دروست کردنی دەنگی وروژێنراو کە منداڵ لە ڕێگەی هاندانەوە فێری دەبێت، بەم جۆرە بە هێزکردنی رەفتاری ئاخافتن لە ڕێگەی کەسانی دیکەوە ئەنجان دەدرێت.

**٣. تیۆری شیکارکاری زانیاریەکان ( تحلیل المعلومات ):**

چۆفیسکی بە گرنگترین لایەنگرانی ئەم تیۆرە دادەنرێت، هەروەها (بیاجێە) یەکێکە لە پێشەواکانی ئەم تیۆرە، خاوەنەکانی ئەم تیۆرە وادەبینن کە هەر منداڵێك مەیلێکی بۆ ماوە، وراپیو توانایەکی



زگماکی ئەو تۆی هەیە کە بە هۆیانەوە بتوانێت زمانیان پێ وەرگرێتو بۆ چەند شێوازێکی ڕێزمانی پۆلێنیان بکاتو پاشان هەڵسێت بە دانای کۆمەڵێك دەستوور لەلای خۆی بۆ پاساودانو شرۆڤە کردنی ئەو سیستەمانەی کە لە رەفتاری زمانی گەورەدا ئەیدۆزێتەوە، ئەمدجار ئەو یاسا ڕێزمانییانە بەکار دەێنێت بۆ دەربڕێنی ڕستەی تازەی ئەوتۆ کە پێش خۆی هیچ کەس دەری نەبڕیوە، لێرەدا ئەوە دەبینین کە لایەنگرانی ئەم تیۆرە جەختێکی زۆر دەکەنە رۆڵی منداڵ لە فێربوونی زماندا.

دەتوانین بلێین ئەم تیۆرە لەسەر سێ بنەما بەندە، وەکو:

**بنەمای یەکەم:**

توانای زگماکی منداڵ (منداڵ بە هۆی ئەو توانا زگماکیەوە دەتوانێت پوختەی ئەو یاسا ڕێزمانییانەی کە سیستەمی زمانەکەی بەڕێوە دەبات وەرگرێت).

**بنەمای دووەم:**

سەرتاپای زمانی دیاری کراو (اللغە الکلیە المحددە) کە منداڵ لە ڕێگەی وەرگرتنی زمانەوەی ماددە زمانەوانیەکەی لێ وەردەگرێت. لایەنگرانی ئەم تیۆرە

باوەڕیان وایە کە هەرچ منالآن هەیە لە جیهاندا فێری ڕێزمانی ئاڵۆز دەبن، ئەمەش ئاماژە بۆ کردنە بۆ بوونی چۆرێك لە توانا لە مرۆڤ دا کە یارمەتی دەدات بۆ وەرگرتنی زمان لە ڕێگەی شیتەڵ کردنی زانیياریە زمانیەکانو ئاماژە بۆ کردنە بۆ بوونی هەندێك نمونە لە پێکهاتەی زمانی ئەوتۆ کە یارمەتی مندالّ دەدات بۆ دەست نیشان کردنی یاسای ڕێزمانی دیسان ئاماژە کردنە بۆ بوونی شێوەی گشتی لە پێکهاتەی زمانی کە تیایدا هەموو زمانەکانی مرۆڤ بەشداری دەکەن، بۆ نمونە هەموو ڕستەیەك لە هەر زمانێکدا بێت، لە کۆمەڵێك وشە پێك دێت، کە لەناو کردارو پیت تێناپەرێت.

کورتەی قسەی لایەنگرانی ئەم تێورە سەبارەت بە زمان وەرگرتن ئەوەیە کە زانایان دان بەوەدا دەنێن کەمرۆڤ ئامادەباشیەکی بایەلۆژی وای تێدایە کە بۆ هۆیەوە دەتوانێت لەسەر چەند بنمایەکی دیاری کراو هەڵسو کەوت لەگەڵ ژینگەدا بکات، مندالآن زمانی نەتەوەیی خۆیان لە ڕێگەی ئەو زانیاریە زمانیونازمانیانەوە فێر دەبن کە تووشیان دەبێت.



**یەکەی سێیەم**



## لایەنە فیزیۆلۆژییەکانی زمان

زمانیش هەر بە چەشنی هەموو چالاکییە سروشتیەکانی دیکەی مرۆڤ، وەکو (ڕێکردن و خواردن و خواردنەوە و خەوتن و دەست شۆرین و... هتد) بە کارێکی ئاسایی دادەنرێت.

زمان کۆمەڵە دەنگێکە، کە بۆ دەربڕینی هزر بەکاردێت. بە شێوەیەکی سەرەکی زمان پشت بە دەنگ دەبەستێت. ئا لەبەر ئەمەیە لێکۆڵینەوە لە دەنگ کارێکی زۆر پێویستە بۆ تێگەیشتن لە دیاردەی زمان. هەروەها توێژینەوە لە دەنگ زۆر سودبەخشە بۆ تێگەیشتن لە پرۆسیسی زمان وەرگرتن.

بۆ توێژینەوەی دەنگیش پێویستە لەم خاڵانەی خوارەوە بکۆڵینەوە:

١. ئەوەی پێوەندی بە پرۆسیسی ئاخافتنەوە هەبێت، لەگەڵ ئەوەی پێوەندی بە لایەنی فیزیۆلۆژی و ئەرکی ئەندامەکانی درکاندنەوە هەبێت (نطق) وەك شێوەی ژمارە(٢).

٢. ئەوەی پێوەندی هەیە بە گواستنەوە و بڵاوبوونەوەی دەنگەکان لە هەوادا، کە ئەمیش سروشتی فیزیکی دەنگەکان دەگرێتەوە.



٣. ئەو لایەنەی کە پێوەندی بە وەرگرتنەوەی دەنگەوە هەیە، کە پێی دەوترێت لایەنی بیستن، ئەویش لە میکانیزمی بیستندا خۆی دەنوێنێت.

ئەمانەی کە دێن هەندێکن لەو لایەنانەی کە ڕۆڵیان هەیە لە پرۆسیسی زماندا:

### ڕشتەی ئاخافتن: ( جهاز التصويت )

مەبەست لە ڕشتەی ئاخافتن ئاماژە کردنە بۆ توانای مرۆڤ بۆ دەربڕینی دەنگەکان لە کاتێکدا، کە هەندێك لە ئەندامەکانی بە ئەرکی خۆیان هەڵدەستن.

ڕشتەی ئاخافتن لە مرۆڤدا پێکهاتووە لە:

١- ڕشتەی هەناسەدان: ئەرکی ئەم ڕشتەیە ناردنی هەوای پێویستە بۆ دەربڕینی دەنگە زمانییەکان.

٢- قورگ (الحنجرة): ئەمیش سەرچاوەی دەنگەوزەی بەکار هێنراوە لە کاتی ئاخافتندا.

٣- بۆشاییەکانی ناو دەم و لووت، کە دەکەونە سەرووی زمانۆچکەوە. ئەمانە زۆربەی دەنگی بەکار هێنراوی قسە کردن دروست دەکەن و پێیان دەوترێت لەرە لەرکەرەکان (الرنانات).

**١- ڕۆڵی ڕشتەی هەناسەدان:**

کرداری هەناسەدان دوو قۆناغی گرنگ دەگرێتەوە:

أ. هەناسە وەرگرتن (الشهيق) کە بریتییە لە هەڵمژینی هەوا بۆ ناو سییەکان. ئەمیش لە ڕێگەی فراوان بوونەوەی بۆشایی سینگەوە ئەنجام دەدرێت.

ب. هەناسە دانەوە (الزفير) ئەویش بریتی یە لە فڕێدانی هەوا بۆ دەرەوە لە ڕێگەی گەڕانەوەی بۆشایی سینگ بۆ قەبارە سروشتیەکەی. لە قۆناغی هەناسە وەرگرتندا ناو پەنچك گرژ دەبێتەوە، کە دەبێتە هۆی شۆڕ بوونەوەی هەناو بۆ لای خوارەوەی سینگ و ماسولکە بەرز کەرەوەکانی پەراسووەکانیش گرژ دەبنەوە و دەبنە هۆی فراوانبوونەوەی قەبارەی پێشەوەی سینگ. بەم شێوەیە سینگ فراوان دەبێت و پەستانی ناوەوە کەم دەکات و دەبێتە هۆی چوونە ژوورەوەی هەوا بۆ ناو سییەکان لە ڕێگەی هەردوو کونی لووت و دەمەوە. بەم جۆرە ژوورۆچکەکانی سییەکان (الحجرات الرئوية) دەکرێتەوە بۆ ئەوەی پڕ لە هەوا بن. بەڵام لە کرداری هەناسەدانەوەدا قەبارەی سینگ بچووکتر دەبێتەوە، لەگەڵ خاو بوونەوەی ناو پەنچك و ماسولکە بەرز کەرەوەکانی پەراسووەکان،



بەم جۆرە پەستان دەکەوێتە سەر سییەکان و پاشان هەوا دەچێتە دەرەوە.

کاتێك کە مرۆڤ قسە دەکات، دەست دەکات بە هەڵمژینی هەوا سییەکانی پێ پڕ دەکات. هەر کە دەستی کرد بە قسە کردن، ماسولکەکانی زگ پێش قسە کردن پاڵنانی هەناو بەرەو بەشی لای خوارەوەی سینگ. ئا لەم کاتەدا ماسولکەی نێوان پەراسووەکان بە جوڵەیەکی خێرا گرژ دەبنەوە پاڵ بە هەواکەوە دەنێن بۆ سەرەوە. ئەو هەوایەش بە نێوان ئەندامەکانی دروستکردنی دەنگدا تێدەپەڕێت و بە جووڵەی لەسەر خۆ ماسولکەکانی زگ بەردەوام گرژ دەبنەوە تاکو مرۆڤەکە کۆتایی بە وتنی ڕستەی یەکەم دێنێت. بەم جۆرە لەکاتی تەواو بووندا ماسولکەکانی هەناسە وەرگرتن جارێکی تر بە خێرایی سینگ پڕ لە هەوا دەکەنەوە، بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤە ڕستەی دووەم گۆ بکات، ئەم کردارە بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت...

**٢- قورگ و دەنگەوزە :**

قورگ بە سەرچاوەی دەنگەوزەی مرۆڤ و هەموو

گیاندارێکی خاوەن قوڕگ دادەنرێت. قوڕگ لە شێوەی سندوقێکی کرکڕاگەییدایە، دەکەوێتە لای سەرەوەی بۆڕی هەوا. لەژێر زمان و بەرامبەر گەروو. کە پێوەی لکاوە.

قوڕگ: لە چوار کرکڕاگە پێك دێت (الغضروف):

أ- کرکڕاگەی بازنەیی، دەکەوێتە ژێر قوڕگەوە، کە لە شێوەی ئەنگوستیلە دایە.

ب- کرکڕاگەی دەرەقی، کە قەبارەکەی گەورەترە.

ج- دوو کرکڕاگەی بچووکی شێوە قوچەکی.

د- کرکڕاگەیەك کە پێی دەوترێت زمانۆچکە، دەکەوێتە لای سەرەوەی قوڕگەوە. لەکاتی قووتدانی خواردندا قوڕگ دادەخات.

**٣- ئەو بۆشاییانەی کە دەکەونە سەرووی زمانۆچکەوە.**

ئەم بۆشاییانە ڕۆڵی لەرە لەرکەر (الرنانات) دەبینن. کاتێك ئەو دەنگانەی کە لە قوڕگەوە دەردەچن و بەم بۆشاییانەدا تێدەپەڕن و دەبنە هۆی لەرینەوە بۆشاییەکان.

بۆشاییەکانیش کە ژمارەیان (سێ)یە ئەمانەی خوارەوەن:

أ- گەروو (البلعوم).

ب- بۆشایی دەم.

ج- بۆشایی لووت.



گەروو جێگەی بە یەك گەیشتنی (ملتقی) ڕێگاکانی دەم و لووت و بۆڕی هەناسەیە و دەلکێت بە سورێنچکەوە، کاتێك شێوە و قەبارەی گەروو دەگۆڕێت لە ئەنجامی ئەو گۆڕینە لەرەکانی دەنگیشت دەگۆڕێت.

بەڵام بۆشایی دەم لە ئەنجامی جوڵەی زمان لە ناویدا، هەمیشە شێوە و قەبارەکەی لە گۆڕاندا دەبێت.

بۆشایی دەم لەمانە پێك دێت:

**١. بەشی سەرەوە: پێی دەوترێت مەڵاشوو.**

مەڵاشوو پێك دێت لە:

- مەڵاشووی ڕەق، کە لە بەشی پێشەوەیە.
- مەڵاشووی نەرم، کە لە بەشی دواوەیە. لەبەر ئەوەی ئەم بەشە توانای جوڵانەوەی هەیە. هەڵدەستێت بە کردنەوە و داخستنی بۆشایی لووت. کۆتایی ئەم بەشەش بە عەرەبی پێی دەڵێن (اللهاة).

**٢. بەشی خوارەوە پێك دێت لە :**

- زمان: لە کرداری دەنگدانەدا(التصویت) ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێت، چونکە زۆر لەناو بۆشایی دەمدا دەجووڵێتەوە. وەکو هەندێك جار بە مەڵاشووەوە دەلکێت، یان گێڕ دەبێتەوە یاخود بە لێواری ددانەکانەوە دەلکێت. ئەمیش دەبێتە هۆی یارمەتی دانی مرۆڤ بۆ دەربرینی دەنگی

جۆراو جۆر.

– ددان: هەبوون و نەبوونی ددانەکانیش کارێکی گەورە دەکەنە سەر کرداری دەنگ دان.

– هەردوو لێو (الشفاه): ئەمانیش لە کاتی ئاخافتندا زۆر دەجولێنەوە قسەکەر دەتوانێت هەردوو لێوی قوتکاتەوە (ضم) یان درێژ یان خڕیان کاتەوە یاخود بیاننوقێنێت (اطباق).

هەرچی بۆشایی لووتیشە شێوە و قەبارەی بە چەسپاوی دەمێنێتەوە، هەروەها ڕۆڵیشی لە دروستکردنی لەرە لەرەدا لە چەسپاوی دەمێنێتەوە. ڕۆڵی ئەم بۆشاییە بریتی یە لە دروستکردنی هەندێك دەنگی مینگەدار (الغنة) و بێ مینگە.

میکانیزمی دەنگدانك: دەقاو دەق وەکو کرداری دەرپەڕینی ئاوازێك وایە کە لە ئامێرێکی مۆسیقای ژێدارەوە دەرچێت. سینگ و سییەکان شوێنی تورەکەی هەوا (المنفاخ) و بۆڕیەکانی هەناسەش شوێنی کەناڵی هەوا دەگرنەوە. ئەو هەوایەی کە لەسییەکانەوە دێتە دەرێ، لەناو قوڕگدا دەگۆڕێت بۆ دەنگێك کە پێی دەوترێت دەنگی شمشاڵی (الصوت المزماري). پاشان هەر کە ئەو دەنگە گەیشتە لای گەروو و دوو چاڵەکەی لووت



ئاوازەکەی دەگۆڕێت. لە ئەنجامی ئەم گۆڕانەش ئاخافتن دروست دەبێت و بۆ هەر یەك لەم گۆڕینانەش پیتێکی دەنگ دەکرێت بە هێما.

بەم شێوەیە دەنگ لەناو قوڕگدا دروست دەبێت و بە ڕێگای هەندێك ماسولکەوە ئەم کارە ئەنجام دەدرێت.

## گرژکردنەوەی دەنگەژێیەکان

تەسك کردنەوە یان پانکردنەوەی کونی زوڕنا (المزمار) کونی زوڕناش ناوچەیەکی سێ گۆشەییە و دەنگە ژێیەکان لە دوو لاوە دەوریان داوە. کرداری دەنگدان جێبەجێ نابێت هەتاوەکو دەنگەژێیەکان لە یەکتر نزیك نەبنەوە. چونکە ئەم لە یەکتر نزیك بوونەوەیە دەبێتە هۆی لەرینەوەیان. لە یەکتر دوور کەوتنەوەی ژێیەکان لەگەڵ کرداری هەناسەدانی ئاسایی دا دەگونجێت، بەڵام لە یەکتر نزیك بوونەوەیان دەبێتە هۆی دەنگدان بە مەبەستی ڕاگەیاندن.

هەروەك لەم وێنەیەی خوارەوەدا ڕوونکراوەتەوە.




وێنـەی (أ) هەناسـەدانێکی ئاسـاییە و دوور کەوتنـەوەی دەنگەژێیەکانی تێدا دەبینرێت.

وێنەی (ب) دۆخـی دەنگەژێیـەکان نیشان دەدات لـە کاتی هەناسە دانێکی بە هێزدا.

وێنـەی (ج) دۆخـی دەنگەژێیـەکان نیـشان دەدات لـەکاتی دەربڕینی دەنگێکی کزدا.

وێنـەی (د) دۆخـی دەنگەژێیـەکان نیـشان دەدات لـەکاتی ئاخافتندا.

دەنگی پەیدابوو سێ سیفەتی بنەچەیی هەیە:

**أ- تونـدیی (الـشده):** پێویـستە بـە قـەبارەی هـەوای پاڵنراوی ناو کونی زوڕنا و توندیی دەرپەڕینی.

**ب- بـەرزیی (ارتفـاع) دەنـگ:** بەنـدە بـە کـورتی و درێـژی دەنگەژێیـەکان و هـەروەها بەنـدە بـە گـرژی و خاوییان، واتە کاتێك دەنگەژێیەکان کورت و گرژ بن دەنگەکە زیقن (حاد) دەبێت.



**ج- ئـاوازی دەنـگ (لحن الـصوت):** ئەو دەنگەی کە پەیدا دەبێـت دەنگێکـی سـادە نییـە بـەڵکو لـە دەنگێکـی بنـەڕەتی و کۆمـەڵێك دەنگـی لاوەکـی، کـە پێیـان دەوترێت هۆرمۆنی پێك دێت.

دەتوانین بڵێین دەنگی قوڕگی چەند لەرەیەکی جیاوازی هەیـە. ئـەم جیاوازیانـەش بەنـدن بـە خێرایـی کردنـەوە و داخستنی قوڕگـەوە، هـەروەها بـەرزی دەنـگ پێوەسـتە بـە کۆمـەڵێك سـیفاتی خـۆیی و تەمـەن و توخمـەوە. جا هـەر چـەندە دەنگەژێیـەکان کـورتتر و بـاریکتربن ئەوەنـدە لەرینەوەیان زیاد دەکات. ئا ئەمەیە نهێنی بەرزی دەنگی منداڵ و ئافرەت لە چاو دەنگی پیاوان.

## ڕشتەی ئاخافتن

مەبەست لەم ڕشتەیە ئەوەیە کە کاری دەنگ دروستکردن ئەنجام دەدات. ئەم ڕشتەیەش لەمانەی خوارەوە پێك دێت:

١- هەردوو سییەکان: ئەرکیان ئەوەیە کە هەوای ناوەوە فڕێ دەدەنە دەرەوە.

٢- بۆڕییەکانی هەوا: ئەمانیش بریتین لەو ڕێرەوەی (ممر) کە هەوای فڕێدراوی سییەکانی پێدا تێپەڕ دەبێت.

٣- قوڕگ (الحنجرة) ئەمیش سەرچاوەی دەنگە وزەیە کە لەم کڕکڕاگانەی خوارەوە پێك دێت:

- کڕکڕاگەی گەروو، دەکەوێتە خوارووی گەرووەوە.
- کڕکڕاگەی دەرەقی. پێشی دەوترێت (سێوی ئادەم).
- دووکڕکڕاگەی بچووکی شێوە قوچەکی (هرمی) کە دەنگەژێیەکانیان پێوە دەنووسێت.
- زمانۆچکە (لسان المزمار) ئەمیش قەباغێکە دەکەوێتە لای سەرەوەی قوڕگەوە لەکاتی قووتدانی خواردندا قوڕگ دادەخات.



٤- گەروو (الحلق) بۆشاییەکە دەکەوێتە نێوان قوڕگ و بەشی دواوەی مەلاشوو. ئەمیش ڕۆڵی خۆی هەیە لە دروستکردنی ئاوازی دەنگدا.

٥- زمان (اللسان) ڕۆڵێکی مەزن دەبینێت لە کرداری دەنگداندا. لە هەموو ئەندامەکانی تر نەرمترە (مطاوع) بۆ جوڵانەوە و درێژ بوونەوە و گرژ بوونەوە و لار بوونەوە بۆ هەموو لایەك. لەبەر ئەو ڕۆڵە گەورەیەی کە ئەم ئەندامە دەیگێڕێت لەکاتی دەنگداندا خەڵکی ناوەکەیان بڕیوەتە باڵای کرداری ئاخافتن. بۆیە بەم کارە دەڵێت زمان. وەکو دەوترێت زمانی عەرەبی یان زمانی فەڕەنسی... هتد.

٦- مەلاشووی نەرم (اللهاة) دەکەوێتە ئەوپەڕی بۆشایی ناو دەم.

٧- بۆشایی لووت، ئەمیش ئەو بۆشاییە کە هەوای دەرچووی سییەکانی پێدا دەچێتە دەرێ لە ڕێگەی ئەم بۆشاییەوە هەردوو دەنگی میم و نوونی عەرەبی پێ دەردەبڕدرێت.

٨- بنمیچی دەم: ئەو بنمیچەی ناو دەمە کە زمان لە بارە جیا جیاکانیدا بەری دەکەوێت.

٩- ددانەکان، کە بریتین لە بڕەڕو و کەڵبە و خرێکان

(كاكیلەكان). ددان ڕۆڵێكی گرنگ لە كرداری دەنگدا دەگێڕێت.

١٠- هەردوو لێو (الشفتان). ئەم دوو ئەندامەش ئەندامی جوڵەدارن، نوقاندن و كردەوەیان یارمەتی گۆكردنی (نطق) گەلێك دەنگ دەدەن.



## بنەما دەمارییەكانی ئاخاوتن و بیستن

ئاخاوتن بەكردارێكی ڕەمزیی دەربڕین (رمزية تعبيرية) دادەنرێت و یەكێكە لە ئەركەكانی مێشك، ئاشكرایە مێشك دەبێت بە دوو بەشەوە. بەشی لای ڕاست كە زاڵ دەبێت بەسەر جموجۆڵی بەشی لای چەپی لەش. هەروەها بەشی لای چەپی مێشك زاڵ دەبێت بەسەر زۆربەی چالاكییەكانی مرۆڤ. هەندێك بەڵگەی دیكەش ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە هەر دوو نیوەی مێشك دەست دەگرن بەسەر هەموو لەشدا و هەر یەكەیان چەند چالاكییەكی تایبەت كۆنترۆڵ دەكات. هەر نیوەیەكی مێشك لە چوار پل (فص) پێك دێت.



هەریەكەیان لەوی دیكە بە دوو كەندۆكە (أخدود) جیا دەكرێتەوە. ئەوانیش كەندۆكەی (ڕۆلاندو) كەندۆكەی (سیلیفۆس) ن. هەروەكو لە وێنەی ژمارە (٤) دا ڕوونكراوەتەوە.

## پلەكانی ( فصوص ) مێشك ئەمانەن

١- ناوچەوانە پل (الفص الامامي): دەكەوێتە بەشی پێشەوەی مێشك، كەندۆكەی (ڕۆلاندو) لە بەشی دواوە و كەندۆكەی (سیلفیۆس)ش لە بەشی خوارەوەی جیا دەكاتەوە.

٢- دیوارە پل (الفص الجداري): دەكەوێتە بەشی دواوەی مێشك بۆ لای سەرەوە، لەنێوان كەندۆكەی سیلفیۆس و پشتەپلدا درێژ دەبێتەوە.

٣- لاجانگە پل (الفص الصدغي): دەكەوێتە ژێر كەندۆكەی (ڕۆلاندو) ەوە بەرەو دوا درێژ دەبێتەوە هەتاكو دەگاتە پشتە پل (الفص القفوي).

٤- پشتە پل: ئەمەیان بچووكترین پلە. دەكەوێتە بەشی خوارەوەی مێشك.

مێشك بە سەنتەری كۆنترۆڵ كردن دادەنرێت. بە هاوكاری لەگەڵ بەشەكانی دیكەی ڕشتەی دەماردا ڕۆڵێكی

کاریگەر دەگێڕێت. ئەو وروژێنەرانەی (البواعث) کە لە کاریگەرە هەستییەکانەوە (المؤثرات الحسية) دێن و دەگەنە شوێنە جیاجیاکانی مێشك. پاشان بە ڕێگەی ئەو شانە ماسولکانەی کە کۆنترۆڵی جموجۆڵی لەشی دەکەن دەگەڕێنە دواوە.

هەر وەکو لەم وێنەیەی خوارەدا ڕوونکراوەتەوە.




**ڕۆڵی مێشك لە زمان ( ئاخافتن ) دا**

بۆ زانینی ڕۆڵی مێشك لە زماندا چەند ڕێگەیەك دەکرێن بە بەڵگە:

١- ڕێگەی لەناوبردن (الاتلاف): هەندێك جار چەند بەشێکی مێشکی مرۆڤ تووشی هەندێك لەناوچوون دەبێت. ئەویش لە ئەنجامی نەخۆشییەکی (پەتا) یان ڕووداوێکی ئۆتۆمبیل، یان کەوتن یان تووشی بوون بە گرێی پیسی ناو مێشك. لەم حاڵەتانەدا لێکۆڵەر هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوەی شوێنەواری ئەم لەناوچوونانە، لەسەر ڕەفتاری زمانیی (السلوك اللغوي) مرۆڤە نەخۆشەکە.

٢- ڕێگەی وروژاندن (الاستثارة): هەندێك جار برینکارەکان بە ناچاری هەڵدەسن بە کردنەوەی کەللەی سەر بۆ چارەسەر کردن. لەم حاڵەتانەدا دەتوانرێت ئەم هەلە بقۆسترێتەوە و هەندێك شوێنی دیاری کراوی مێشك بە ڕێگەی تەوژمی کارەبا بورووژێندرێت و پاشان لە ئەنجامی ئەم ورووژاندنە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو مرۆڤە دەکرێت بۆ ئەوەی بزانرێت تا چەند ئەم کارتێکردنە دەبێتە هۆی بەر پەرچ دانەوە و وەڵام دانەوە.

وێنەگرتن بە گەرمی (التصوير الحراري): لەم ڕێگەیەشدا ئامێری وێنەگرتنی هەستیار بۆ گەرمی، لەجیاتی ڕووناکی بەکار دێت. شتێکی ئاشکرایە کە هەر چالاکییەك لە هەر پارچەیەکی لەشدا ڕوو بدات دەبێتە هۆی دەرکەوتنی گەرمەوزە(طاقة حرارية) لەناو لەشدا. زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کە پارچە تووشبووەکانی لەش

بە گرێ یان هەوکردن پلەی گەرمیان جیاواز دەبێت بەرامبەر بە بەشەکانی دیکەی لەش. لە چەند دۆخێکی جیاوازدا وێنەی گەرمیی مێشك دەگیردرێت و پاشان ئەم وێنانە دەگۆڕدرێن بۆ وێنەیەکی فۆتۆگرافی ئەوتۆ کە بتوانێت دەربارەی ناوچە چالاکەکانی مێشك مانا ببەخشێت.

**ئەو ناوچانەی مێشك کە پێوەندییان بە زمانەوە هەیە**

أ- ناوچەی جموجۆڵ: ئەم ناوچەیە دەکەوێتە بەرامبەر کەندۆکەی (ڕۆلاندو) هوە. کە تایبەتمەندە بە چالاکی و جوڵە و فرمانەکانەوە، کە قسەکردنیش دەگرێتەوە. ئەو ناوچەیەی کە بەرپرسە لە ئاخافتن، پارچەیەکە کۆنترۆڵ دەکاتە سەر جوڵەی دەم و چاو لە بەشی سەرەوە هەتاکو جوڵەی لێوو لچ و زمانیش. هەروەها ئەم ناوچەیە وا لە مرۆڤ دەکات کۆنترۆڵ بکاتە سەر شوێنی دەنگەکان (مخارج الصوت). ئەمیش ئەوە دەبەخشێت کە مرۆڤ پێچەوانەی ئاژەڵە. چونکە ئاژەڵ ئەم سیفاتانەی تێدا نییە.

ب- ناوچە پەیوەستەکان: المناطق الرابطة.

لە میانەی لێکۆڵینەوە و چارەسەر کردنی نوژدار و



زاناکان بۆ نەخۆشەکانیان، بە تایبەتی دکتۆری فەڕەنسی (برۆکا) کە لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر مێشکی نەخۆشێکی خۆی ئەنجام دابوو، کە توانای ئاخافتنی نەمابوو. لەو لێکۆڵینەوەیەدا بۆی دەرکەوت کە هۆی ئەم نەخۆشییە دەگەڕێتەوە بۆ پەککەوتنی ناوچەوانە پل (الفص الأمامي). کە دەکەوێتە نیوەی لای چەپی مێشکەوە لە سەرووی کەندۆکەی (سیلفیۆس) و بە درێژایی ئەم کەندۆکەیە درێژ دەبێتەوە. بۆیە ناوی ئەم نوژدارە بڕاوەتە باڵای ئەم ناوچەیە و پێی دەوترێت ناوچەی (برۆکا) کە ئەم ناوچەیە دەکەوێتە سەرووی گوێی چەپ و کەمێك بەرەو پێشەوە. جا هەر کەسێك ناوچەی (برۆکا) ی تووشی نەخۆشی ببێت دەتوانێت ئاوازی گۆرانییەك بڵێتەوە بەڵام ناتوانێت وشەکانی دەربڕێت. هەر چەندە هەوڵدەدات بۆ وتنەوەی وشەکان بەڵام زۆر بە قورسی و سستی دەیانڵێتەوە و لە ڕووی ڕێزمانیشەوە ڕستەکانی زۆر لاواز دەبن.

لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەی (فەرەنکا) دا ئاشکرا کراوە کە لەناوچوونی توێکڵی لاجانگە پلی (الفص الصدغي) لای چەپ کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر

ناوچەی بیستنەوە و کەمێك بەرەو دواوە کشاوە، ئەم لەناوچوونە دەبێتە هۆی لە دەستدانی توانای تێگەیشتن لە ئاخافتن. بەم ناوچەیە دەوترێت (فرەنکا) ئەگەر کەسێك بەم نەخۆشی یە تووش بووبێت دەتوانێت زۆر بە ڕەوانی قسە بکات و بە دروستی دەنگەکان گۆ بکات و لە ڕستەی ڕێزمانی تەواودا بەکاریان بهێنێت. بەڵام گرانیەکی زۆر دەبینێت و لەوەی کە وشەکانی بیر بێتەوە بۆیە وشەی دیکە لە جیاتی بەکار دێنێت.

لەمیانەی لێکۆڵینەوەکانی ورووژاندندا دەرکەوتووە کە تێپەڕبوونی تەوژمی کارەبا بە هەندێك شوێنی دیاری کراوی مێشکدا دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەی زمان گیربوون (الحبسة). ئەم نیشانەیە بەردەوام دەبێت تاوەکو تەوژمە کارەباییەکە ڕادەوەستێت. ئەمیش ئەو ناوچانەن کە لە وێنەی ژمارە (٤) دا دیارن.






١. ناوچەی فرەنکا.

٢- ناوچەی برۆکا.

٣- بەشێك لە جووڵە ناوچەی زیادە- بەرامبەر کەندۆکەی رۆلاند. ئەم سێ ناوچەیە لە یەك نیوە لە نیوەکانی مێشکدا پێکەوە لە بارودۆخی ئاساییدا کار دەکەن، بۆ کۆنترۆڵ کردنی لایەنە هزرییەکانی ئاخافتن. ڕۆڵی سەرەکییان بریتییە لە ئاگادار بوون لە وشەکان.

کاتێك کە بەشی خوارەوەی (جووڵە ناوچە) توشی لەناوچوون دەبێت، نیشانەکانی زمان گیربوونی جووڵەیی (الحبسة الحرکیة) دەردەکەوێت.

## ناوچەکانی بینین لە مێشکدا

ئەوەی شایانی باسە شوێن و ناوچەی (زمانیی – بینینی – اللغویە البصریە) جیاوازە لەگەڵ شوێنی (زمانیی – بیستنی – اللغویة السمعیة). بە هەمان شێوە ناوچەی جووڵەی ئاخافتن جیاوازە لەگەڵ ناوچەی جووڵەی نووسین. ئەو ناوچەیەی کە بەرپرسە لە نووسین دەکەوێتە کۆتایی پنتکی (بقعة) ی فرەنکاوە، کەچی ئەو پنتکەی کە بەرپرسە لە (ئاخافتن – بەبینین – الکلام بصریا) دەکەوێتە سەرووی پارچەی برۆکاوە.



## یەکەی چوارەم



## گەشە کردنی زمانی منداڵ

گەشە کردن بە پرۆسەیەکی بەردەوام دادەنرێت. ئەویش پێکهاتووە لە کۆمەڵێك لایەن، یەکێك لەوانە لایەنی زمانییە. منداڵیش لە گەشەکردنیدا بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕیت. لە هەر قۆناغێك لەو قۆناغانەی کە منداڵ پێدا تێدەپەڕێت، لایەنی زمانی و لایەنەکانی دیکەش لە لای بە شێنەیی گەشە دەکات. سەرەتای قۆناغی قسەکردنی منداڵ بە قیژەو هاواری بێ هوودە دەست پێدەکات. ئا لەم قۆناغەدا منداڵەکە هیچ مەبەستێکی نییە، بەڵام ئەم قیژاندنە لە یەکێك لە قۆناغەکانی تەمەنیدا گەشە دەکات، تاکو دەگاتە قیژاندنێکی مانادار. دەنگ (پیت)و (وشە)و ڕستە بەکار دێنێت تاکو گوزارشت لە خواستەکانی بکات.

گەشەکردنی زمان لە لای منداڵ پشت بە کۆمەڵێك هۆکار دەبەستێت و پەیوەستە بە زیرەکی و دروستی ڕشتەی دەمارو (الجهاز العصبي) و ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی دەوڵەمەند.



## قۆناغە کانی گەشەکردنی زمان لە لای منداڵ

دەشێت قۆناغەکانی گەشەکردنی زمانی منداڵ بەم جۆرە دیاری بکەین.

**١. قۆناغی گەشە کردنی یەك وشەیی کە پێك دێت لە :**

أ. قیژەی لە دایك بوون (صیحة المیلاد) : منداڵ لەگەڵ یەکەم سات و وەختی لە دایك بوونیدا دەری دەبڕێت و دەبێت بە نۆبەرەی توانای دەنگ دەربڕین و خاڵی سەرەتای گەشەکردنی زمانی منداڵەکە. ئەم قیژاندنەی منداڵ زانایانی دەروونناسی و فەیلەسوفەکانی سەرسام کردووە. هەندێکیان وایان لێکداوەتەوە کە ئەم قیژاندنە ناڕەزایی کۆرپەکەیە بەوەی کە فڕێ دەدرێتە ناو پانتایی ئەم جیهانە نوێیەوە.لە ڕاستیدا ئەم قیژاندنە سەرەتای هەناسە دانە کە لە ئەنجامی پاڵ پێوەنانی هەوایە بە شێوەیەکی زۆر بەهێزو تێپەڕبوونی بەسەر قوڕ قوڕاگەدا بەرەو سییەکان ئەمجا لەرینەوەی دەنگە — ژێیەکان بۆ یەکەم جار.

ب. (الصراخ): ئەم کارە لە سەرەتادا بە چالاکییەکی ماسولکەیی دادەنرێت، پاش ماوەیەك

دەبێتە کارێکی خۆ ویستیی کە منداڵ بۆ دەربڕینی حاڵەتەکانی خۆی سودی لێ وەردەگرێت.

**٢- قۆناغی ئاخافتنی تەلەگرافی:**

(براون) و (فریزەر) ناوی زمانی تەلەگرافییان بۆ ئەم قۆناغەی منداڵ داناوە. هەر کە ژمارەی وشەکان لە لای منداڵ بگاتە پەنجا وشە، مانای وایە بوو بە خاوەنی سەروەتێك لە وشەو ئیتر بە هۆیەوە دەتوانێت گوزارشت لە خودی خۆی بکات، بە تایبەتی کە تەمەنی دەگاتە دوو ساڵ لەشی پتەو دەبێت و توانای ڕێکردن و جوڵانەوەی جێ گۆڕکێ پەیدا دەکات. ئەمەش یارمەتی دەرە بۆ ناسینەوەی دەوروبەری خۆی. ئەمجا پرسیار لە شتەکان دەکات و وەڵامیان بۆ وەردەگرێت، ئەمیش خۆی دەبێتە سەروەتێکی زمانی.

لەم تەمەنەدا منداڵ دەست دەکات بە دروست کردنی ڕستەیەك کە تەنها لە دوو ووشە پێکهاتبێت. لە پێکهێنان و ئامادەکردنی ئەو ڕستانەدا پەیڕەوی سیستەمێکی تایبەتی دەکات کە لە سیستەمی بروسکە (البرقية) دەچێت. ئەم سیستەمە سەر سوڕهێنەرە تایبەتە بە خودی منداڵەکەوە. بۆ نمونە



کاتێك کە منداڵەکە دەڵێت (باوکە قوتابخانەیە)، ماناکەی لەو میانەدا دەردەکەوێت کە تیایدا ئەم جۆرە دەستەواژانە دێتە بەرهەم. دەشێت مەبەستی ئەمە بێت بڵێت (باوکە ئەمە قوتابخانەیە) یان (باوکە چووە بۆ قوتابخانە).

لەوانەیە منداڵ لە کاتی بەکارهێنانی ئەم زمانە هەندێك ئاماژەش بەکاربهێنێت لە جیاتی ئەو وشانەی کە دەریان نابڕێت.

**٣- قۆناغی پرسیارکردن :**

قۆناغی کۆرپایەتی (الطفولة المبكرة) کە دەکەوێتە نێوان تەمەنی (٢ – ٦) ساڵییەوە بەوە جیا دەکرێتەوە کە منداڵ پرسیارێکی ئێجگار زۆر دەکات. بۆیە بەم قۆناغە دەوترێت قۆناغی پرسیار کردن. زۆرترین پرسیارەکانی منداڵ ئەو جۆرە پرسیارانەیە کە بە هۆیەوە دەیەوێت ئەو شتانەی دەوروپشتی خۆی بناسێتەوە و لەو زانیاریانە تێبگات کە پێیدا تێدەپەڕێت. بۆیە لەم قۆناغەدا بەیەك گەیاندنی زمانی (الموصول اللغوی) لە لای منداڵ بە شێوەیەکی گەورە گەشە دەکات.

دەستەواژە زمانییەکان لەم قۆناغەدا بەرەو ڕوونی و ووردیی لە دەربڕین و تێگەیشتن دەڕوات. ئاخاوتنی باشتر دەبێت و قسەکردنی منداڵانەی نامێنێت و زیاتر لە قسەی خەڵکی تر تێدەگات.

**لێرەدا دەربڕینی زمانیی بە دوو قۆناغدا تێدەپەڕێت :**

أ-قۆناغی کورتە ڕستە: ئەم قۆناغە لە تەمەنی سێ ساڵیدا دەردەکەوێت. ڕستەکان سادەو بە کەڵکن لە (٣-٤) وشە پێك دێن. هەرچەندە ڕستەکان لە ڕووی پێکهاتەی زمانییەوە دروست نەبێت، بەڵام لە ڕووی ئەرکەوە دروستن و واتاش دەگەیەنن.

ب-قۆناغی ڕستەی تەواو: ئەم قۆناغە لە تەمەنی چوار ساڵیی منداڵ دەردەکەوێت. ڕستەکانیش لە (٤-٦) وشە پێك دێن و ڕستەی تەواوو واتادارن. لە ڕستەکانی تر ئاڵۆزتر و ووردتر دەبن.

**٤- قۆناغی ڕستەو پێکهاتەی ئاڵۆز :**

وەکو لەمەو پێش بینیمان منداڵ لە قۆناغەکانی فێربوونی قسەکردندا یەکەم جار وشە و ڕستەی بەکار دەهێنا، پاشان ڕستەیەکی دوو وشەیی، کە ئەمیش چوونە ناو قۆناغی دەربڕینەو،جێهێشتنی قۆناغی گڕوگاڵە.



لاساییکردنەوە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە ڕاستکردنەوەی زمانی منداڵ و ئاراستە کردنی، بە تایبەتی لە کاتی گواستنەوەی لە قۆناغی بەکارهێنانی وشەوە بەرەو بەکارهێنانی ڕستە. هەروەها زیادبوونی سەروەتی زمانیی و چەمکەکانی یارمەتی دەدەن بۆ گواستنەوەی لە قۆناغی بەکارهێنانی وشەوە بۆ قۆناغی دەربڕین بە ڕستە. کاتێك کە منداڵ تەمەنی دەگاتە شەش ساڵان نزیکەی (٢٥٠٠) وشە فێر دەبێت و ڕادێت لەسەر لێکدانی وشەکان بە پێی ماناکانیان لە ناو کورتە ڕستە یان ڕستەی نیمچە تەواو. واتا دەتوانێت ڕەمزە زمانییەکان ببەستێتەوە بە هەڵس و کەوتی دەوروبەری خۆی. پاشان ئەم ڕەمزانە لە ناو وشە و ڕستەدا یەك دەگرنەوە. منداڵەکە پەیوەستیان دەکات بە واتاکانیانەوە و دەبن بە ئامرازێکی کۆمەڵایەتی بۆ لەیەك گەیشتن.زانایان وا دەبینن کە دەرکەوتنی ڕستە لە لای منداڵ لە ئەنجامی گەشە کردنی ڕشتەی دەمارەکانێتی کە ماوە بە منداڵ دەدات نەخشە بۆ ڕستەکانی بکێشێت و بیدرکێنێت پێش ئەوەی لە یادەوەرییەکانیدا نەمێنن. ئەم گەشە کردنە نوێیەش

ماناى زياد بوونى زانيارييه له لاى منداڵ.

**٥- قۆناغی بیرکردنەوەو تێگەیشتن :**

پـێش ئـەوەی منـداڵ دەسـت بكات بـه قسه كـردن، هەر له سەرەتاوه له ڕووی بیستن و ئەقڵەوه ئاگاداری ئـەو قـسەكردنانه دەبێـت كـه لـه چـوار دەورو ئـەو ژینگەیـەی کـه تیایـدا دەژێت گوێی لـێ دەبێت. بـەم جـۆره هــەوڵ دەدات لــەو وشــه و ناوانــەی كــه بــۆ شتەكان دانراون تێبگات. جا بۆ ئەوەی زمانی منداڵ لـه قۆنـاغی قیژاندنـەوه گەشـه بكات بۆ وشـەو ڕسـته پێویسته منداڵەكه پاڵنەرێكی دەروونی بۆ تێگەیشتن و زانیاری تێدابێت.

منــداڵ كاتێــك كــه گــوێ بیــستی قــسەكردنی دەوروپــشتی دەبێــت، هــەوڵ دەدات لــەو ڕســتەو پێكهاتـه زمانییانـه بگـات كـه گـوێی لێیـان دەبێـت. پاشان هەڵدەستێت به لاسایی كردنەوەو وتنـەوەیان. ئەمیش مانای وایه كه هێزی ئەقڵی بەكار هێنـاوه بۆ تێگەیشتن و درك پێكردن پـێش ئـەوەی فرمان بـدات به زمانی بۆ گۆكردنیان.

گومانی تێدا نییه كـه زمـان پێوەندییـەكی بـەهێزی



به (هزر) ەوه هەیه، چونكه قسه كردن به بێ بوونی ئـەقڵ ناكرێـت. كاتێـك قـسەكردنمان لـه لا دروسـت دەبێت كه بمانەوێت ئەو هـزرەی لامانـه دەری بـبڕین. گفتەی وتراو یان بیستراو تەنها ڕوخساری دەرەوەی ئەو هزرانەن.

## یەکەی پێنجەم





## زمان و هزرو واتا

هەر لە دێر زەمانەوە و بە درێژایی گەشە کردنی هزری ئادەمیزاد، پرسی پێوەندیی زمان بە هزرەوە زاناو ڕۆشنبیرانی سەرقاڵ کردووە. زانایانی دەروون وایان ڕوانیوەتە زمان کە دیاردەیەکی دەرونییەو پەیوەستە بە فسیۆلۆژیای ڕشتەی دەمارو ئەو ئەندامانەی کە بەشداریی دەکەن لە دەربڕینی زمانیی. ئەوان وایان داناوە کە زمان کۆمەڵێك هێمایە کە دەگونجێت بۆ دەربڕینی حاڵەتەکانی هەست، واتا حاڵەتەکانی هزر و سۆز و ویست.

هەروەها هەندێك لە زانایان وەکو (برجسون) وا دەڕواننە پێوەندی نێوان هزر و زمان کە لەیەك دوورن و پێوەندییان بە یەکەوە نییە. وە هەندێکی تریش لەو زانایانە وەکو (فبکوتسکی) دەڵێن زمان و هزر لە دوو ڕەگی جیاوازەوە چەکەرە دەکەن بەڵام دوای گەشە کردنی منداڵ یەك دەگرنەوە. هەندێکی دیکەشیان دەڵێن زمان و هزر دوو شتی جیاوازن بەڵام پێوەندی نێوانیان زۆر توند و تۆڵە.

زمانی مرۆڤ هەر تەنها خاوەنی هێمای ڕوخساریی نییە بەڵکو ئەو مانایانەی کە ئەم هێمایانە دەری دەبڕن کۆمەڵگای خاوەن ڕەمزەکان دەتوانێت دیاریی بکات.

هەروەها ئەو هەڵوێستەیش کە قسەی تێدا کراوە ڕۆڵ دەبینێت لە دەست نیشانکردنی مەبەستی قسەکەر.

ئا بەم جۆرە، لەو شتانەی کە باسمان کرد، بۆمان دەردەکەوێت کە زمانی مرۆڤ هەر تەنها هێمایەو نیشانە نییە بەڵکو پەیوەستیشە بە هزرو ماناوە.

**یەکەم: دانانی( أعتبار) وشە بە هێماو نیشانە:**

زمان بەوە جیا دەکرێتەوە کە توانای کۆکردنەی نیشانەو هێمای ماناداری هەیە. کاتێك کە مرۆڤ هێمای زمانی بەکار دێنێت مەبەستی ئەوەیە دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت بەسەر ئەو شتانەی کە لە دەورو بەریدایە. هەروەها بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی بەسەر ئەو کارو چالاکییانەی کە لە مەودای ئەودا دەخولێنەوە. بەڵام ئەم هێمایانە بێ سوود دەبن ئەگەر مرۆڤ نەتوانێت شتەکان و ڕووداوەکان لەیەك جیا بکاتەوە و دەستە دەستە لەگەڵ یەکتر دایانبنێت، وەکو ماڵ و داروو درەخت و جل و بەرگ.

کاتێك کە مرۆڤ گەورە دەبێت، زانیارییەکانی زیاد دەکات و زەخیرەیەکی زۆر لە ڕەوشتی وەرگیراو بە دەست دێنێت. ئەم زەخیرە وا لە قسەکەر دەکات کە بکەوێتە ژێر هەندێك ئەرکی فێربوونی تازەوە، هەروەها دەیخاتە ژێر



هەندێك ئەرکی کۆنتر کە پێشتر فێری بووە. بۆیە دەتوانین بڵێین هەر ئەرکێکی مانادار ئەرکێکی فێرکارییە یاخود هزرێکی تازەیەو خەڵکی بە ئاسانی فێری دەبن، چونکە ئەو ئەرکانە شتی کۆنی فێربووی پێشووتری تیایە ئەمەش بەو ڕێگەیە دەکرێت کە پێی دەوترێت گواستنەوەی کاریگەری ڕاهێنان (إنتقال أثر التدریب).

لەگەڵ زیاد کردنی ژمارەی پێوەندیەکانی ئەو وشانەی کە تاك فێری بووە لە ئەنجامی فراوان بوونی ئەزموونەکانی، مانای ووشەکانیش زیاتر ڕوون دەبنەوە. ئەمجا هەرچەندە ماناکان ڕوونتربن ئەوەندە خێرایی فێربوون زیاد دەکات . بۆ ڕوونکردنەوەی بیرۆکەی پێوەندی (الارتباطات) ئاماژە دەکەین بۆ لێکۆڵینەوەکەی (بافلوف)کە تیایدا مەرجێك دادەنێت بۆ سەگەکەی بۆ دەردانی لێك کە گوێی لە دەنگی زەنگەکە دەبێت بافلۆف خۆی لە بوونی ئەو پێوەندییەدڵنیا کرد کە وای لە سەگەکە کرد کەشتێك بکات، ئەو شتەش بە بێ بوونی پێوەندێك ناتوانرێت ئەنجام بدرێت.

بە کورتی دەڵێین :

١-پێوەندی کردارێکی ناوەکییە، لە ناو ناخی گیانلەبەردا (الکائن) ڕوو دەدات، کە تیایدا

وورياكەرەوە جووت دەكرێت لەگەڵ بەشێك لە وەڵامدانەوەيان لەگەڵ بەهرەی هەست پێكردن (الحدث الاداراكي الحسي).

٢-ڕەنگە بە جووت هێنان (الاقتران) يان كرداری دەروونی بەشێكی وەها كەم لە دەنگەوەهاتنی بنەڕەتی پێكبهێنێت كە تەنانەت تێبينيش نەكرێت.

٣-هەر ئەم كردارە دەروونيە خۆيەتی كە ناوی مانای ئاگاداركەرەوەی زمانێتی (التنبيه اللغوي) بەسەردا دەدرێت. ئەگەر ووشەی (گورگ) وەكو ئاگادار كەرەوەی زمانيی بەكار بهێنريت ئەو كاتە واتايەكی دەبێت و بەشێك لە وەڵام دانەوە دروست دەكات، بە چەشنی ئەو وەڵام دانەوەيەی كە خودی بينينی گورگەكە دروستی دەكات.

**دووەم: مانای واتايی و مانای ويژدانی:**

وشە گۆكردنێكە كە واتای هەيە، شێوەی واتا لە زمانی ئادەميزاددا بەوە دەردەكەوێت كە هێما بتوانێت ئەو واتايە بە شێوەيەكی پەتی دەربڕێت. منداڵ مانای هيچ وشە فێر نابێت تاكو ئەو كاتەی كە تيايدا دەتوانێت چەند وێنەيەكی زەينی يان هەندێك مانای ڕووداوو شتەكان لە



مێشكدا دروست بكات بۆ ئەو شتانەی كە وشەكان ئاماژەی بۆ دەكەن.

لێكۆڵەرەوان دوو لايەنی مانايان لە يەك جياكردووەتەوە، ئەوانيش لايەنی واتايی (الجانب الدلالی) و لايەنی ويژدانی (الجانب الوجدانی) مەبەست لە مانای واتايی ئەوەيە كە وشە ئاماژەی بۆ دەكات. بۆ نمونە ئەگەر لە كەسێك بپرسيت و بڵێی پێنووس چييە. كەسەكەش ئاماژە دەكات بۆ ئەو پێنووسەی كە لە دەستی يان لە گيرفانی دايە. بەڵام بۆ لايەنی ويژدانی مەبەستمان لەو مانا ويژدانيانەيە كە لە ووشەكاندايە. واتا بوارێكی فراوانتر لە بيرو مەيل بۆ كردارەكە هەيە.

بۆ ڕوونكردنەوەی هەردوو لايەنەكە، واتا لايەنی واتايی و لايەنی ويژدانی دوو نمونە دەهێنينەوە. لە عەرەبيدا دەوترێت (أبناء السبيل) و (ابناء الشارع) ئەم دوو دەستەواژەيە هەمان مانای واتاييان هەيە. بەڵام هەريەكەيان مانايەكی ويژدانی جياوازی هەيە. ووشەی (السبيل) واتا شەقام بەڵام ئەو كاردانەوەی كە ووشەكان دەيروژێنن جياواز دەبن. دەستەواژەی (أبناء السبيل) مانايەكی ويژدانی دەردەبڕێت. واتا ڕێبواری هەژار (أبناء الشارع)يش مانای كەسانی گومڕا دەبەخشێت. پێويستە

بوترێت كه مانای ویژدانی زۆربەی وشەكان گرنگ تره لە مانا واتاییەكانیان.

ئەو هۆكارانەی كه یارمەتی دەدەن بۆ دۆزینەوەی جۆری واتای وشە ئەمانەن:

– میانەی قسەكردن. كە ڕێگە دەگرێت لە نێوان مانای فەرهەنگی و نێوان ڕاستی بیرۆكەكە كە ڕستەكە دەری دەبڕێت.

– ئەو ئەزموونە درێژەی ئەو كەسانەی كە زمانەكە بەرهەم دێنن و وەری دەگرن سەبارت بە مێژووی ووشەكەو پێوەندی بەو واتا جیاوازانەوە كە لێی چاوەڕوان دەكرێت.

**سێیەم : گەشەكردنی واتاكان لە لای منداڵ:**

بۆ ئەوەی باشتر لە بابەتی گەشە كردنی واتاكان لە لای منداڵ بگەین، باشتر وایە چۆنیەتی دروست بوونی واتا بخەینە ڕوو.

فێربوونی واتاو دروست بوونیان بە چەند ڕێگەیەكی جیاواز دەبێت وەكو :

أ–مەرج دانان (الاشتراط) : مەرج دانان ڕۆڵێكی گرنگ و بەرچاو دەگێڕێت لە دروست كردنی واتادا . گرنگترین شت لە مەرج داناندا هەردوو كرداری جیاكردنەوە و بە گشت كردنە (التمییز والتعمیم) جا



لە ڕێگەی بە گشت كردنەوە كۆمەڵێك حاڵەتی تاك تاك لەیەك پۆلدا دادەنێین پاشان لە ڕێگەی جیا كردنەوە ئەو حاڵەتە تاك تاكانەی ناو پۆلەكە لەیەك جیادەكەینەوە یاخود پۆلێك لە پۆلێكی تری پێ جیادەكەینەوە.

ب– شیكار كردنی زانیارییەكان : ژمارەیەكی زۆر لە زانایانی دەروون بڕوایان وایە كە ئادەمیزاد بوونەوەرێكی كارامەیەو خاوەنی كۆمەڵێك ڕشتەی هەست كردنی ئەوتۆیە كە بە هۆیانەوە دەتوانێت لە نهێنیەكانی جیهانێكی دەوڵەمەند و ئاڵۆز تێبگات. ئەم زانایانە كە (چۆمسكی)ش یەكێكە لەوان وا دەبینن كە منداڵ بە ماوەیەكی زۆر كورت كە لە سی مانگ تێپەڕ ناكات فێری بنەماكانی زمانی نەتەوەكەی دەبێت.

بەڵام (بیاجیە) بڕوای بە بوونی دوو كرداری بنەڕەتی هەیە لە دروست كردنی مانادا (المفاهیم) ئەوانیش:

١– وێناكردن (التمثیل) : واتا توانای مرۆڤ بۆ دەرهێنانی زانیارییە لێكچووەكانی ژینگە و ئەو زانیارییانەی كە پێشتر لە مێشكیدا زەخیرەی كردووە.

٢-ڕێکخستن (الموائمة) : واتا ڕێك و پێکی ئەوەی زەخیرە کراوە تاکو بگونجێت لەگەڵ زانیارییە تازەکان. هەندێك لە لێکۆڵەرەکان بڕوایان وایە کە منداڵ فێری زمان و واتای ووشە دەبێت تەنها لە ڕێگەی بیستنەوە بێ ئەوەی خۆی بەشداری تیا بکات.

٣-کارلێکی ووشە (التفاعل اللفظي) : بە هۆی ئەم ڕێگەیەوە منداڵ فێری ژمارەیەکی زۆر لە ووشەو ماناو پێکهاتە دەبێت. ئەمیش یان ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگەی پێناسە کردنەوە دەبێت، وەکو دەڵێین : دوورگە پارچە زەوییەکە کە ئاو لە هەموو لایەکییەوە دەوری داوە. یان بە ڕێگەی نمونە هێنانەوەو لێکچواندنەوە، یاخود بە ناڕاستەوخو لە ڕێگەی ناوەڕۆکەوە، پاشان لە ڕێگەی بەکارهێنانە جیاوازەکانەوە دەتوانین واتای زۆر وورد بۆ ووشەکان دانێین.



**چوارەم: پێوەندی نێوان زمان و هزر:**

لێکۆڵەران و زانایان گرنگیەکی زۆریان داوە بە پێوەندی نێوان زمان و هزر، مشت و مڕێکی زۆریش سەبارەت بەم پێوەندییە کراوە. زۆربەی زانایانی دەروون وادەبینن کە ئەم پێوەندییە زۆر توند و تۆڵە، زۆر جار دەڵێین : زمان تەنها بریتیە لە دەربڕینی هزر. هەروەها دەڵێین زمان بریتیە لە دەربڕینی هەست و سۆز. ئەمجا ئەگەر بپرسین بڵێین : مانای ئەم دوو گوفتارە چییە ؟ لە وەڵامدا دەڵێین : هزر کردنەوە و هەست و سۆز دەکەونە پێش زمانەوە.

بۆ دیاری کردنی پێوەندی نێوان هزرو زمان چەند پرسیارێك دێتە کایەوە وەکو:

ئایا زمان و هزر لەیەك جودان، یان هەردووکیان یەك شتن، یاخود بە واتایەکی تر ئایا زمان ڕێڕەوی هزر دیاری دەکات و سنووری بۆ دەکێشێت؟

لێکۆڵەرانی دەروونناسی زمانیی هەوڵیان داوە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە. وەڵامەکانیشیان بە چەند ئاراستەیەك دەرکەوتووە وەکو :

**١- زمان و هزر یەك شتن :**

ئەم بۆچوونە هەڵوێستی قوتابخانەی ڕەوشتیی (المدرسة السلوكية) دەر دەخات. لەسەر زمانی

باقلوف و واتسن و سکنەر. ئەم زانایانە ئاماژە دەکەن بۆ زمانی دەرەکی و زمانی ناوەکی (اللغة الخارجیة واللغة الداخلیة). دەڵێن زمانی دەرکی بریتییە لە دەنگی گۆکراو (أصوات منطوقة) بەڵام زمانی ناوەکی بریتیە لە کرداری هزر کردنەوە. ئەمەش مانای وایە کە قسەکردن و هزر دوو ڕووی یەك دراون کە ئەویش زمانە. بە پێی بیرو بۆچوونی ڕەوشتییەکان (السلوکیون) ئاخاوتن جوڵەی سیەکان و قوڕقوڕاگەو سەرجەم ئەندامانی ناو دەمە. ئاخاوتن دەکەوێتە ژێر کۆمەڵێك یاساوە کە جڵەوی هەموو جووڵەیەك دەگرێتە دەست. هەرچی هزریشە، ڕەوشتییەکان نکوڵی لێ دەکەن هەر وەك چۆن نکوڵی لە سەرجەم ڕاڤە کردنە عەقڵییەکانی تر دەکەن. ئەمان نکوڵی ناکەن لەو دیاردانەی کە کەسانی غەیری خۆیان ناوی لێدەنێن هزر بەڵام نکوڵی لەو ڕاڤە کردنانە دەکەن کە پێی دەوترێت ڕاڤەکردنی تێڕامان (التفسیرات الاستبطانیة) بۆ ئەو دیاردانە.

(سکنەر) وای داناوە کە هزر جۆرێکە لە ڕەوشتی مرۆڤ هەر وەکو ڕەوشتی زمانیی. وە نایەوێت بە دوو شتی جیاواز دابنرێن و جیاوازی بخرێتە نێوانیانەوە.



کاتێك تەماشای کرداری هزرکردنەوە دەکەین، پێوەندی بەهێزی نێوان زمان و هزرمان بۆ دەردەکەوێت. هزرکردنەوەی ئێمە لە ئەنجامی ئەو شتانەوەیە کە لە خەڵکی ترەوە دەیبینین و هەستی پێدەکەین و حەز دەکەین ئەو شتە هەست پێکراوانە بگوێزینەوە بۆ کەسانی تر ئەم کارەش بەبێ زمان ئەنجام نادرێت چونکە هەر زمانە پەیتا پەیتا ووشەمان بۆ مەیسەر دەکات بۆ ئەوەی بیبڕینە باڵای شتە ماددی و مەعنەوییەکانی. هەر بە هۆی زمانەوە دەتوانین هزرو میراتی کەلتوور بگۆزینەوە. گەر زمان نەبێت هەرچی بیری مرۆڤ هەیە لەناو دەچێت.

بەڵام بۆچوونەکەی قوتابخانەی ڕەوشتیش بەر ڕەخنە کەوتوون و بە تاقی کردنەوەی کردارەکی کە تیایدا هەموو ڕشتەی گۆکردن بە ماددەی سڕکەر لەکار خراون و بە تەواوی ڕێگەی گۆکردنیان لێگیراوە کەچی ئەم کارە هیچ شوێنەوارێکی لەسەر کرداری هزرکردنەوە بەجێ نەهێشتووە. (واتسون)ش کە خۆی یەکێکە لە لایەنگرانی قوتابخانەی ڕەوشتیی لەگەڵ بیرۆکەکەی خۆی ناکۆکە. ئەو سەلماندوویەتی کە مرۆڤ هەموو کاتێك لە ڕێگەی زمانەوە بیرناکاتەوە.

دەڵێت: کاتێك کەسێك وڵامی هەڵوێستێك یان شتێکی دیاری کراو دەداتەوە، لەم کاتەدا هەموو ئەندامەکانی لەشی وەڵامی ئەو هەڵوێستە دەدەنەوە. لە ڕاستیدا یادەوەری چالاکییەکی لایەنی گۆکردنە لە ڕەوشتێکی گشتی. بۆ نموونە ئەگەر لێت بپرسم چۆن بۆینباغەکەت دەبەستیت، دەبینین ناتوانیت وشە بدۆزیتەوە بۆ وەسف کردنی کردارەکە، بەڵام بۆ ئەوەی ڕوونی کەیتەوە کە چۆن ئەو کارە دەکەیت هەڵدەسیت بە بەستنی بۆینباغەکە.

### ٢- هزر زمان کاری تێدەکات

بە بڕوای هەندێك لە لێکۆڵەرەوان زمان بەرهەمی شارستانیەتی میللەتەو ئەو ئامرازەیە کە بە هۆیەوە شارستانیەتی لە وەچەکانی پێشووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ وەچەکانی دواتر. (هەمبولت) و (سابیر) و (دەورەق) لە لایەنگرانی ئەم ڕایەن. ئەمان بڕوایان وایە کە ڕۆڵی‌زمان لە دوو ڕووەوە دەردەکەوێت :

ا–دروست کردنی ئەو ڕێگەیەی کە کۆمەڵگایەکی تایبەت بیری پێدەکەنەوە. بۆ نموونە ئەو گەلانەی کە



خەریکی کاری کشتوکاڵن زمانەکانیان پڕە لەو وشانەی کە پێوەندیی بە کشتوکاڵەوە هەیە و زۆرترن لەو وشانەی کە پێوەندییان پێوە نییە. بە هەمان شێوە زمانی عەرەبی سەردەمی جاهیلی پڕە لە دەیان ووشەو پێکهاتەی زمانیی کە باس لە هەور لمو و ڕاوکردن و کەش ناسی و شتی تر دەکات، کە بەشێکی زۆری لە ژیانی تایبەتیان پێك هێنابوو.

ب–بنیاتی زمانە، یان پێکهاتەی زمانە، کە هزر دیاری دەکات و بە تەواوی جڵەوی لە دەست دەگرێت.

### ٣- زمان هزر کاری تێدەکات

لایەنگرانی ئەم بۆچوونە بڕوایان وایە کە هزر دیاردەیەکی لاوەکییە لە چاو ئەو واقیعە بابەتییەی کە بە دیاردەیەکی سەرەتایی دادەنرێت، ئەویش لە ڕێگەی وێناکردنی ئەو واقیعە بابەتییەی کە بە دیاردەیەکی سەرەتایی دادەنرێت ئەویش لە ڕێگەی وێناکردنی (تمثیل) حەقیقەتی بابەتییەوە. ئەم حەقیقەتەش لە لای هەموو گەلان یەك نییە. هەر گەلێك مێژووی تایبەتی و ژیان و شت و بارودۆخی

ماددی و بژێوی خۆی هەیە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە زانیاریی ئەم گەلانە لەیەك ناچێ، واتا سیستەمێکی جیهانی نییە کە هەموو ماناکان بگرێتەوە.

لەبەر جیاوازی ژیانی گەلان، لایەنگرانی ئەم بۆچوونە وادەبینن کە هەموو بیری مرۆڤ و ڕێگەکانی بیرکردنەوەی لە ئەنجامی ئەو زانیارییانەی کە لە ژیانە کردارەکییەکەیدا فێری دەبێت پەیدا دەبێت. بۆیە دەبینین مانا لە لای هەر گەلێك جیاوازە لە مانا لە لای گەلانی دیکە و دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سیفەتەکانی بیرکردنەوەی دەروونی لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی تر جیاواز دەبێت.

**٤- هزر کردنەوە بەبێ بوونی زمان:**

خاوەنی ئەم بۆچوونە وادەبینن کە ئێمە ئەگەر زمانمان هەبێت و نەبێت هەر پەیدەبەین بەو شتانەی کە هەستی پێدەکەین. ئەمجا زمانمان هەبێت یاخود نەبێت هەڵدەسین بە شیکارکردنیان. بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕایە ئەوەیە کە مرۆڤی کۆن دڵخۆش بووە، ئازاری چەشتووە، ئاسوودە یاخود نیگەران بووە بە



پێی ئەو هەڵوێستانەی کە هاتوونەتە سەر ڕێی و بەبێ ئەوەی زمانێکی هەبێت بۆ دەربڕینی ئەو هەستانەی. بەڵام ئەم بۆچوونە بە هانەی زۆری بەهێزی پێنییەو ناتوانێت خۆی لەبەر دەم ئەو ڕەخنانەی لێی دەگیرێن ڕاگیر بکات چونکە مرۆڤ ناتوانێت دەست بەرداری زمان بێت لەکاتێکدا کە بیەوێت بیرکردنەوەیەکی چاك و ووردی هەبێت.

**پێنجەم: ڕۆنانی ڕستەو تێگەیشتنی:**

ڕۆنانی ڕستە ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاو دەگێڕێت لە کرداری تێگەیشتن. بە شێوەیەکی گشتی دەڵێین ڕستەی بکەر دیار زووتر وەڵام دەدرێتەوە لە چاو ڕستەی بکەر نادیار، با زانیارییەکانی ناو هەردوو ڕستەکەش وەکو یەك بن. ئەگەر بڵێین:

کوڕەکە دوو جار وانەکەی نوسیەوە.

وانەکە لە لایەن کوڕێکەوە دوو جار نوسراوەتەوە.

ڕستەی یەکەم ئاسانترە بۆ تێگەیشتن بە گوێرەی ڕستەی دووەم، چونکە ڕۆنانی ڕستەکە ڕوونترو وردترە لە لایەنی زمانییەوە.

(کراف) و (توری) وا دەبینن کە جیا کردنەوەی ڕستە بۆ

پێکهاتە بنەڕەتییەکانی (المکونات الاساسیة) وا لە ڕستەکە دەکات کە گوێگر یان خوێنەر بە شێوەیەکی ئاسانتر لێی تێبگەن. بۆ نموونە ئەگەر دەستەواژەیەکمان خستە پێش دوو کۆمەڵ خوێندکار، بۆ کۆمەڵی یەکەم دەستەواژەکەمان پارچەپارچە کردن بە جیا پیشانمان داو بۆ کۆمەڵی دووەم دەستەواژەکەمان بە یەکەوە نیشان دا، ئەوا دەبینین کە کۆمەڵی یەکەم خێراتر لە ڕستەکە (دەستەواژەکە) تێدەگەن لە چاو کۆمەڵی دووەم.

| کۆمەڵی یەکەم | کۆمەڵی دووەم |
| --- | --- |
| ئەنجومەنیباوکان و مامۆستایان دانیشتنێکی پەروەردەییان ساز کرد. بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ڕێگەی گونجاو. بۆ چارەسەر کردنی لاوانی خوێندکار. | ئەنجومەنی باوکان و مامۆستایان دانیشتنێکی پەروەردەییان ساز کرد بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر ڕێگەی گونجاو بۆ چارسەر کردنی لاوازی خوێندکاران. |

دەتوانین بڵێین کە چەند هۆکارێك یان یاسایەك هەیە جڵەوی کرداری تێگەیشتن و درك پێکردنی ووتاری



زمانیی دەگرنە دەست وەکو:

١. ئەو ڕستانەی کە بە فرمان دەست پێدەکەن و بکەر دیارن باشتر منداڵ لێیان تێدەگات لە چاو ئەو ڕستانەی کە بکەر نادیارن.

٢. دابەش کردنی ڕستەی درێژ بۆ چەند بەشێکی چوون یەك و گونجاو ئاسانتر دەبێت لەو ڕستانەی کە ووشەکانی لەپاڵ یەکدا ڕیز دەکرێن و یەك جار دەوترێتەوە.

٣ . نەبوونی وشەی نامۆ لە ناو ڕستە بە گوێرەی منداڵ.

**شەشەم: ڕۆڵی یادەوەری لە تێگەیشتندا:**

وەکو ئاشکرایە کە بواری یادەوەری ئادەمیزاد کورتە. بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت لە ڕستە تێبگات پێویستە ئەو ڕستەیە لە یادەوەریدا بهێڵێتەوە تاکو شیکاری بکات. جا لەبەر کورتی یادەوەریی، هەرچەندە ڕستەکە درێژ بێت ئەوەندە تێگەیشتنی گرانتر دەبێت.

بۆ نموونە سەرنجی ئەم ڕستەی خوارەوە بدە:

ئەو پیاوەی کە دزەکەی گرت کە ئەو بەڵگە نامەیەی دزیبوو کە لە لای ئەمین بوو نەکو لە ناو بچێت و گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ ئێمە و کەسانی ترو کەس و کارو خزمان ئەو هاوڕێی ئامۆزای دەزگیرانی براکەمە.

ئەم ڕستەیە گرانە چونکە درێژە، گوێگر ناچار دەبێت لە یادەوەری کورت مەودادا بهێڵێتەوە بۆ ئەوەی بۆ ناوەڕۆکی پێکهاتە بنەڕەتییەکانی شیکار کاتەوە. لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە کە هەرچەندە ڕستە بکەوێتە ناو ڕستەی بنەڕتییەوە ئەوەندە زۆرتر قورسی دەکەوێتە سەر یادەوەری کورت مەودادا. ئەم کارەش دەبێتە بەربەست لە پێش شیکار کردنی بۆ پێکهاتە بنەڕەتییەکانی و تێگەیشتنی. کاتێك مرۆۋ وتارێکی زمانیی دەبیستێت، وردیی یادەوەرییەکەی بۆ شیکارکردنی ئەو وتارە پشت دەبەستێت بەم هەنگاوانەی خوارەوە :

١-کاتێك کە گوێی لە ووتارە زمانییەکە دەبێت هەڵدەستێت بە دەست نیشانکردنی فرمانی زمانی (الفعل اللغوي) و ناوەڕۆکی ڕاگەیاندن و ناوەڕۆکە هزرییەکەی.

٢-لە ناو یادەوەرییەکانیدا دەگەڕێت بە دوای ئەو زانیارییانەی کە دەکەونە بەرامبەر زانیاری وەرگیراو.

٣. زانیاریی تازە بە یەکێك لەم ڕێگایانەی خوارەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

أ-ئەگەر ڕستەکە هەواڵیی بوو، ئەوا گوێگر هەندێك زانیاریی تازە دەخاتە سەر زانیارییە کۆنەکانی.



ب-ئەگەر ڕستەکە ڕستەیەکی پرسیاری (ئەرێ) یان (نەرێ) بوو ئەوا گوێگر لە ناو یادەوەرییەکانیدا دەست دەکات بە گەڕان بە دوای زانیاریی گونجاو و پاشان بەراوردی دەکات لەگەڵ زانیاری داواکراودا وەڵامی گونجاوی بۆ دادەنێت.

ج-ئەگەر ڕستەکە ڕستەیەکی پرسیاریی ئەوتۆ بوو کە داوای زانیاریی لە گوێگر بکات، ئەوا گوێگرەکە دەست دەکات بە گەڕان بە دوای زانیاریی داواکراو لە ڕستەیەکی وەڵامیدا ڕێکی دەخات.

د-ئەگەر ڕستەکە داخوازیی بوو یان پاڕانەوە یان.. هتد، ئەوا گوێگر یان فرمانی داواکراو جێبەجێ دەکات یان گوێی پێنادات یاخود ڕەفتارێکی دیکە دەنوێنێت.

ئا بەم شێوەیە وەکو پێشتر بینیمان، یادەوەریی ڕۆڵێکی گرنگ و دیار دەگێرێت لە کرداری بەرهەم هێنانی قسەکردن و پێشوازی کردن، کە سەرئەنجام دەبێتە هۆی تێگەیشتن، چونکە یادەوەریی وەکو کۆگایەك دادەنرێت بۆ زانیاریی. کاتێك لە دەرەوە داخوازییەك لەسەر شێوەی وتاری زمانیی ڕوو دەدات، ئەم ئەو دەورژێنێت و مانایەك بۆ ئەو داخوازییە دادەنێت.

## یەکەی شەشەم





### دەستنیشان کردنی جێبەجێ کردنی زمانیی

مەبەستمان لە دەستنیشان کردنی جێبەجێ کردنی زمانیی، بەکارهێنانی ئەمموون و ئامێرو کەرەسەو شێوازی یاساییە لە پێناو زانینی جێبەجێکردنی زمانیی تاکە لە ڕووی دەنگی پیت و شوێنی دروست بوونیانەوە، هەروەها مەبەستمان زانینی کەم کورییەکانی ئاخافتن و هۆیەکانێتی لەگەڵ دانانی پلانی خۆپاراستن و چارەسەرکدن لە ئەگەری هۆکارەکانی.

### شێوازەکانی دەستنیشان کردنی جێبەجێ کردنی زمانیی

لێکۆڵینەوە زمانییەکان پەیڕەوی جۆرەها پرۆگران و ڕێبازیان کردووە، ڕێبازەکان وردە وردە گەشەیان کردووە تاکو وایان لێهاتووە کە بتوانن نزیک ببنەوە لە بواری توێژینەوەی زانستی ئەزموون کراو (البحث العلمي التجريبي) ئەمانەی دێن هەندێکن لەو شێوازو پرۆگرامانە:

**یەکەم:** ئەزموون و پرۆگرامەکانی توێژینەوەو دەستنیشان کردن: ئەم شێوازە چەند پرۆگرامێک دەگرێتەوە، وەکو:

**١. تێبینی کردنی ژیاننامەی منداڵ (الملاحظات البيوغرافية):**

لەم شێوازەدا لێکۆڵەر بە بەردەوامی تێبینی منداڵێکی دیار کراویان چەند منداڵێك لە هەمان کاتدا دەکات و ئەمجا دەست دەکات بەسەرژمێری ووشەو دەنگ و دەربرینی منداڵ'کان، ئەم کارەش بە چەند ڕێگەیەکی جیاواز دەکرێت، وەکو:

أ. سەرنجە پەیوەندی دارەکان (الملاحظات المتصلة): ئەم ڕێبازە تەنها چاودێری یەك منداڵ یان چەند منداڵێکی دیاری کراو دەکات هەر لە سەرەتای لە دایك بوونەوە تاکو تەمەنێکی دیاری کراو کە لێکۆڵەر خۆی دەستنیشانی دەکات.

ب. سەرنجە خولانەکان (المحلاظات الدورية): لێرەدا لێکۆڵەر لە هەندێك کاتی دیاری کراودا هەڵدەسێت بە تۆمار کردنی چەند تێبینیەکی دیاری کراو، ڕەنگیشە هەموو هەفتەیەك و بۆ ماوەی دوو مانگ یان زیاتر هەرجارەی پێنج خولەك سەرەنج بداتە منداڵێکی دیاری کراو و تێبینیەکانی لەسەر بنوسێتەوە.

ج. ئەو تێبینانەی کە تۆمار دەکرێت لەسەر ژمارەیەکیم ڕێژەیی گەورەتر لە منداڵان دەشێت لێرەدا لێکۆڵەر هەڵسێت بەسەرژمێر کردنی ووشتەی



ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە نێوان (٢٠-٤٠) مانگ بێت.

٢. **ئەزموون کردن و تاقی کردنەوە (التجريب والاختبار):**

لێکۆڵەرێکی ئەوروپی بە ناوی (دیگۆر) ئەم ڕێبازەی گرتووەتەبەر، بۆ دروست کردنی ئەزموونە تەواو و نیمچە تەواوەکانی کۆمەڵێك وێنە پرسیاری بەکار هێناوەو لە پێوەرێکی تایبەت بە گەشەکردنی زمان ئەزموونەکانی داڕشتووە.

٣. **پرۆگرامی کلینیکی:**

(گیزل) ئەم پرۆگرامەی بەکارهێناوە، ئەمیش بەرنامەیەکی زانستییەو لە عەیادە دەروونیەکان بەکاردێت بۆ دەستنیشان کردنی کەم و کوڕییەکانی ئاخافتن و چارەسەر کردنیان، ئەم پرۆگرامە بەندە لەسەر دانانی دیاردەی زمانی منداڵ لە ژێر چاوەدێری بە دواداچوونی ئەو هۆکارانەی کە کاردەکەنە سەر شێوەی دروست بوونی دیاردەی دەرکەوتوو.

٤. **پرۆگرامی دەستنیشان کردنی پێش کەوتوو (منهج التشخيص الارتقائي):**

ئەم پرۆگرامە (گیزل) دایناوە لە چەند پرۆگرامێکەوە کۆی کردووەتەوە، لە یەك کاتدا چەند شێوازێکی بەکاردێنێت کە بە هۆیانەوە دەتوانێت زۆربەی لایەنە خراپەکانی بەرنامە تاك تاکەکان وەلابینێت، ئەم شێوازە بە باشترین شێواز دادەنرێت بۆ لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەل لەسەر قۆناغی کۆرپایەتی منداڵ.

لەبەر ئەوەی بابەتەکەمان دەستنیشان کردنی زمانییە بۆیە ئاماژە دەکەینو دەڵێین لێکۆڵەر دەتوانێت سوود لە ئامرازی تەکنەلۆژی نوێ وەرگرێت بۆ دەستنیشان کردنی زمانیی، وەکو: فیلمی سینەمایی، شریتی دەنگ، تیشکە وێنەو لیستی ووشەو هەروەها ئامرازی دیکەش.

**دووەم: شیکارکردنی ئاخافتن خوڕسك (تحليل الكلام العفوي):**

هەندێك لە دەروونناسان پێی دەڵێن پەیوەست کردنی سەربەست (التداعي الحر) کە تیایدا داوا دەکرێت لەو کەسەی کە ئەزموونەکەی لەسەر دەکرێت هەرچی شتێك بە بیریدا بێت بیلێتو لە هەڵبژاردندا سەر پشك دەکرێت،



بەڵام بە تاقی کردنەوەی دەرکەوتووە کە دەتوانرێت ئەم پەیوەست کردنە سەربەستە بە لایەکی دیاری کراودا ئاراستە بکرێت.

لە پێش تەمەنی شەش ساڵیدا منداڵ ناتوانێت وەکو گەورە بە ڕستەی ڕێکو پێك فسەی بکات، هۆکارێکی زۆر هەیە کە جڵەوی زمانی منداڵ دەگرنە دەست، هەندێکیان پەیوەندیان بە سەروەتی زمانیی منداڵەکەوە هەیە یان پەیوەندیان هەیە بە ئاستی هەبوونی شێوازی جێبەجێ کردنو کۆنترۆڵ کردنی، هەندیکی تریش لەو هۆکارانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی لاسایی کردنەوەی زمانییو سەلامەتی ئەو سەرچاوانە.

ڕێگەیەکی زۆر هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی قسەکردنیخۆڕسكو لەم بوارەدا بەکاردێن، هەموو ئەو ڕێگایانەش لقو پۆپی هەردوو ڕێگەی (پەیوەست کردنی سەربەست)و (پەیوەست کردنی سنوردار)ن، وا ئێمە لێرەدا هەندێك لە ڕێگە گنگەکانی باس دەکەین:

١. ڕێگەی پەیوەست کردنی سەربەستی ساکار:

لەم ڕێگەیەدا داوا دەکرێت لە کەسی ئەزموون کراو کە هەر ئەوەندەی گوێی لە دەنگی ووشەی ئاگادارکەرەوە بوو یەکسەر ئەو ووشەیەی لە

خەیاڵیدا دێت زۆر بە خێرایی وەڵام بداتەوە جا چی ووشەی ئاگادارکەرەوە بەدەم وترابێت یان نوسراو بێت، لێرەدا سەربەستیی هەڵبژاردن بێ سنورە، کەسی ئەزموون کراو دەتوانێت بە هەر ووشەیەکی زمانەکەی وەڵام داتەوە، ڕەنگە ئەم ڕێگەیە بە شێوەیەی تاك یان بە کۆمەڵ بکرێتو لەوانەشە تەنها لەسەر کۆمەڵێکی دیاری کراو یان چەند کۆمەڵێك لە دانیشتوان بکرێت.

٢. ڕێگەی پەیوەست کردنی سەربەستی بەردەوام: ئەم ڕێگەیەش لە ڕێگەی پێشوو دەچێت بەڵام جیاوازییەکی لەوەدایە کە لێرەدا داوا لە کەسی ئەزموون کراو دەکرێت کە تەنها بە ووشەیەك وەڵام نەداتەوە، بەڵکو پێویستە لەسەری باسی هەموو ئەو ووشانە بکات کە ووشەی ئاگادرکەرەوە ئیلهامی پێدەدات، ئەمدا دوای ماوەیەکی دیاری کراو چەند وەڵامێك ئەزموونەکە رادەگرێت.

٣. ڕێگەی پەیوەست کردنی سوورد بەخشی ساکار: پێشی دەتورێت پەیوەست کردنی ئاراستە کراو، لێرەدا داوا لە ئەزموون کراو دەکریمٚت کە تنها بە یەك ووشە وەڵام بداتەوە، لێرەدا سەربەستیی



هەڵبژاردنی لێدەسێنرێتەوە، بۆ نمونە داوای لێدەکرێت کە مانای ووشە یان دژە مانای ووشە بڵێتەوە.

٤. ڕێگەی پەیوەست کردنی ئاراستە کراوی بەردەوام: ئەمیش لە ڕێگەی پێشوو دەچێت بەڵام لێرەدا پێویستە لەسەر کەسی ئەزموون کراو، وەڵامی ئەو وشانە بداتەوە کە مانای ڕەگەز یان جۆرە یان پۆل دەگەیننو دەبێت باسی هەموو ئەو شتانە بکات کە پێونەدییان هەیە بەو وشانەوە، ئەمجا پاش ماوەیەکی دیاری کراو ئەزمونەکە ڕادەگیرێت.

٥. ڕێگەی پەیوەست کردنی زنجیرەدار: شێوەی ئەم ڕێگەیە وەکو ڕێگەی پەیوەست کردنی سەربەخۆی بەردەوامە چونکە کەسی ئەزموون کراو بە تەنها وەڵامێك واز ناهێنێت بەڵکو لەسەری پێویستە وەڵامەکەی ببەستێتەوە بە ووشەی ڕاستەوخۆی پێشتر نەوەکو بە یەکەم ووشەی ئاگادارکەرەوە کە لە خاوەن ئەزموونەکەوە (المجرب) دەیبیستێت.

٦. ڕێگەی پەیوەست کردنی دووبارە کراوە: لەم ڕێگەیەدا لەپاش ماوەیەکی کورت یان درێژو بە پێی مەبەستی ئەزموونەکە لیستێکی ووشە

ئاگادارکەرەوەکان پیشان کەسی ئەزموون کراو دەدرێت‌و ئەمجا هەمان وەڵامی جاری یەکەم دووبارە دەکاتەوە.

٧. ڕێگەی پەیوەست کردنی زۆرەملێ (الترابط القسري): بەم ڕێگەیەدا کەسی ئەزموون کراو بە شێوەیەکی خوڕسك وەڵام ناداتەوە بەڵکو داوای لێدەکرێت لە نێوان ژمارەیەك وەڵام ئەو وشەیە هەڵبژێرێت کە بە لایەوە شیاوترەو زیاتر پێوەتدی هەیە بە ووشەی ئاگادار کەرەوەوە.

٨. ڕێگەی پەیوەست کردنی لێکچونی دەنگیی (الجناس الصوتی): زانای رەشتیی (سکنەر) ئەم ڕێگەیەی بەکار هێناوە، لێرەدا سەرەتا خاوەن ئەزموونەکە هەڵدەسێت بە تۆمارکردنی هەندێك نمونەی دەنگیی بێ مانا کە پێکهاتبێت لە چەند پیتێك بە شێوەیەکی هەڕەمەکی (عشوائی) ئەمجا بە کەسی ئەزموون کراو دەڵێت: وا گوێ دەگریت لە نۆ ووشەی شێواو ئەمجا پێویستە لەسەرت هەر شتێك لە مێشکتدا دەوروژێنی دووبارە ئەو شتانە بڵێرەوە، سکنەر وای بۆ دەچێت کە ئەم ڕێگەیە یارمەتیمان دەدات بۆ ناسینەوەی ئەم وشانەی کە لەناو مێشکی مرۆڤدا



کەڵەکەیان کردووەو هاندراون بۆ دەربازبوون لە کۆتەکان‌و بە بچوکترین هۆ دەتوانرێت بوروژێنرێن یان لەوانەیە هەندێ جاربە بێ هیچ هۆیەك هۆیان دەرپەڕن.

٩. ڕێگەی پەیوەست کردن بۆ رۆنانی ڕستە (تالیف جملة) لێرەدا لە کەسی ئەزموون کراو دەکرێت کە لەو ووشانەی ووروژێنراون ڕستە دروست بکات، لێرەدا پەیوەست کردن لە نێوان وشەو ڕستە دەبێت، نەکو لە نێوان ووشەو ووشەیەکی تر.

هەندێك لەو لێکۆڵنەوانەی کە لەسەر پەیوەست کردنی سەربەستی ووشە کراوە، لێکۆڵینەوەکانی (فرەنسیس گالتۆن)ە کە خۆی خەستاوە بە پیشاندانی هەندێك ووشەی ووروژێنەر کە ژمارەیان دەگاتە ٧٥ کارت کە تیایاد هەر ووشەیەك لەسەر کارتێك نووسراوە، پاش چەند رۆژێکی دووبارە ووشەکانی پیشانداوەتەوەو کاتی وەڵامی دانەوەی دەنگیی بە تەنها بینینی ووشەی ووروژێنەر تۆمار کردووە، بۆ ئەم مەبەستە سکنەر کات ژمێری ڕاگرتن (ساعە ایقاف)ی بەکار هێناوە، لێرەدا گەیشتوەتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم وەڵامانە هەڕەمەکی نین بەڵکو بریتین لە هزری مێشکی ئەزموون کراو، ٤٠٪ ووشەی پەیوەست

كردنەكانی گەڕاندوەتەوە بۆ سەردەمی منداڵی (صبا))و ٤٥٪ گەڕاندوەتەوە بۆ سەردەمی پیادەتیو ١٥٪ گەڕاندووەتەوە بۆ هەندێك رووداوی نزیك.

**سێیەم:** بەكارهێنانی جیاوازییەكانی هەردوو توخم:

لێكۆڵینەوەیەكی زۆر لەسەر منداڵ كراوەو زۆر لایەنی گرتوەتەوە، وەكو لایەنی لەشو لایەنی هەلچوونو لایەنی كۆمەڵایەتیو لایەنی عەقلی لەگەڵ باسی كرداری دروست بوونی زمانو گەشەكردنی لە قۆناغە جیاجیاكانی گەشەكردندا، ئەو لێكۆڵینەوانە باسی هۆكارە جیاوازەكانی گەشەی منداڵو هۆكارەكانی فێربوونی زمان، كە مەبەستی ئێمەیە، كردووە.

ئەم لێكۆڵینەوانەی كە باسی زمانیان كردووە، ویستوویانە ئەو هۆكارانە بدۆزنەوە كە بە شێوازێكی دیاری كراو كار دەكەنە سەر جێبەجێ كردن یاخود گەشەكردنی زمانی منداڵ. هۆكاری توخم یەكێكە لەو هۆكارانە، هەندێك لێكۆڵینەوە كراوە بۆ زانینی كاریگەریی توخم لەسەر زمان واتا زانینی مەودای وەبەركەوتنی زمان بەرامبەر هۆكاری توخم.

ئەو لێكۆڵینەوانەی كە لەسەر هەردوو توخم كراون



ئاماژەی ئاشكرا دەكەن بۆ سەركەوتنی مێینە بەسەر نێرینەدا لە بواری وەرگرتنی زماندا لە قۆناغەكانی منداڵیدا، هەندێك لە زانایان ئەو كارە بەوە شرۆڤە دەكەن كە دایك زیاتر لەگەڵ منداڵە مێیەكانیدا دەدوێت چونكە مێینە لە چاو نێرینە زیاتر خو دەداتە دایكی.

لێكۆڵینەوەی زۆر هەیە لەسەر كارتێكردنی توخم لەسەر زمان بەڵام لێرەدا ئێمە ئاماژە دەكەین بۆ هەندێكیان، دكتۆر (مصطفی فهمي) زنجیرەیەك تاقی كردنەوەی كردووە لەسەر هەندێك خوێندكاری تەمەن بچووكی خوێندنگاكانی قاهیرە، بابەتەكەشی لەسەر كەمو كورییەكانی زمانو ئاستی زمانە لەلای هەردوو توخمی نێرو مێ، ئەم لێكۆڵەرە دەبینێت كە خوێندكارە نێرینەكان زیاتر لە خوێندكارە مێینەكان لە قسەكردندا دەشێوێن (أكثر لجلجة)و زیاتر بە شێوازی منداڵانە قسە دەكەن، بۆی دەركەوتووە كە تاكە سیفەتی سەركەوتنی نێرینە بەسەر مێینەدا سیفەتی (دەنگ گۆڕكێ)یە (التبديل الصوتي).

(حامد زهران)یش تەماشای گەشەكردنی زمانی كردووە بە درێژایی قۆناغە جیاوازەكان، دەڵێت كچان سەردەكەون بەسەر كوڕاندا لە هەموو لایەنێكی زماندا، وەكو: دەسپێكی قسەكردنو ژمارەی ووشەكانی زمان لە

سەردەمی شیرە خۆرەییدا، دەڵێت لە نۆبەرەی منداڵیدا (الطفول المبكرة) كچان لە كوڕان خێاتر دەدوێن‌و پرسیاری زۆرتر دەكەن‌و ئاخافتنیان روونترو چاكتر قسە دەكەن‌و ژمارەی ووشەكانیان زۆر ترە لە چاو كوڕان.

**چوارەم: بەكارهێنانی جیاوزییە كۆمەڵایەتیەكان:**

لە نێو ئەو لێكۆڵینەوانەی كە باسی كرداری نێربوونی زمان‌و گەشەكردنی زمان‌و زانینی ئەو هۆكارانەی كار دەكەنە سەریان ئەو لێكۆڵینەوانە كە باسی كاریگەریی جیاوازییە كۆمەڵایەتییەكان دەكەن. (ئەشتێرن) ئەزموونەكانی لەسەر منداڵی چینێكی خوێندەوار كردووە كە زۆربەیان چینی مام ناوەندی بوونەو لە مووچە خۆرو بازرگان‌و خاوەن پارە پێك هاتوونە.

هەروەها ئەزموونێكی كردووە لەسەر منداڵانی كۆمەڵێك كە كەمتر بواری خوێندنیان هەبووەو زۆربەیان سەر بە چینی كرێكاران بوونە، لە ئەزموونەكەیدا بۆی دەركەوتووە كە ئاستی ڕستەو ڕۆنانی منداڵانی چینی خوێندەكارەكان باشتر بووە لە منداڵانی ئەو چینە كە كەمتر خوێندەوار بوونە، ئەم لێكۆڵینەوەو ئەوانی تریش بەڵگەن لەسەر كاریگەری ئاستی رۆشنبیری لەسەر زمان.



لە هەندێك لێكۆڵینەوەی تردا كاریگەریی هۆكاری ئابووری لەسە فێربوونی زمان‌و گەشەكردنی لەلای منداڵ باس كراوە، یەكێك لەو لێكۆڵینەوانە لێكۆڵینەوەكەی دكتۆر (مەكارسی)یە كە لەسەر هەندێك منداڵی كەسانی دەوڵەمەندو كەسانی هەژار ئەنجامی داوە، بۆی دەركەوتووە كە منداڵی دەوڵەمەندەكان لە ووشەی زۆرتر تێدەگەن لە چاو منداڵی هەژار، كەمتر دەجوڵێنەوە هەروەها بە پێچەوانەوەش.

هەروەها هۆكارێكی تر لەو هۆكارە كۆمەڵایەتیانەی كە كار دەكەنە سەر زمان فێربوون‌و گەشەكردنی، هۆكاری ژمارەی ئەندامەكانی خێزانە، بۆ ئەم لێكۆڵەرە دەركەوتووە كە ئەو خێزانانەی ژمارەی ئەندامەكانیان زۆرن، منداڵەكانیان زۆرتر فێری زمان دەبن، بە بڕوای (گیزل) خێزان باشترین گردبوونەوەی بایەلۆژی‌و شارستانیەتە چونكە هەر خێزانەكە باشترین بارودۆخ دەرەخسێنیت بۆ منداڵ بوونی‌و پاراستنیان، هەر خێزانە كە بە هێزترین پێوەندی دروست دەكات لە نێوان كەسانێك كە جیاواز دەبن لە تەمەن‌و لە تۆخم. ئەو كەسانە كاری تازە كردنەوەو دووبارە دروست كردنەوەی عادەتەكان دووبارە دەكەنەوە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە دەبێت زۆر وریا و ئاگادار بین، نابێت ئەنجامەکانی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بە شێوەیەکی ڕەها (مطلق) وەرگرین و یاسای بە گشتی کردنیان (تعمیم) بۆ بکەین چونکە دەشێتی ئەو لێکۆڵینەوانە لەسەر نموونەیەك ئەنجام درابن کە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و روون ڕێك نەخرابێت، یان ڕەنگە ئەو ئەزموونانەی کە لە ژینگەیەکی دیاری کراودا ئەنجام دەدرێت بۆ ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی تر نەگونجێت.



## یەکەی حەوتەم



## خەوشەكانى قسەكردن و زمان

قسەكردن بە دياردەيەكى ئاڵۆز دادەنرێت، چونكە كارێكى زۆرى دەوێت لە ئەندامەكان و ئامێرو ئەو هۆكارانەى كە دەچنە ناو يەكەوە بۆ دروستكردنى ئەو دياردەيە، لەو ئەندامانەش وەك ئەندامى بيستن و زمان و لێوەكان و ناو پەنچك و وسييەكان و ئەندامەكانى ديكەو هۆكارەكانى ديكەش كە دەبێتە هۆى ڕوودانى قسەكردن.

ساغى و سەلامەتى (چاوو گوێ) و ئەندامەكانى ئاخافتن بەس نييە بۆ دەربڕينى دەنگ، هەروەها بايەخدان بە منداڵ لە ڕووى پەروەردەە بەس نييە بۆ فێربوونى زمان، بەڵكو دەبێت مێشك ساغ و سەلامەت بێت و گەشەكردنى خێرابێت.

سەبارەت بە ساغ و سەلامەتى مێشك گەلێك هۆكار هەيە وەك:

– بۆماوە، وەكو ناتەواوى جەستەو لەش.
– هەندێكيان پەيوەندييان بە جۆرى خانەكانى زاوزێوە هەيە.
– مناڵبوونى سەخت.
– خورپە دەروونييەكان (الهزات النفسيه).
– نەخۆشيەكان.



ئەو هۆكارانەى كە كۆرپەو منداڵى بچووك پێدا تێدەپەڕێت دەبێتە هۆى تێكچوونى جياوازە ترسناكەكان:

**يەكەم:** جۆرەكانى خەوشى قسەكردن و زمان:

ئەم خەوشانە لە چەند شێوەيەكدا دەردەكەوێت، وەك:

١. كەمى سەروەتى زمانى لەلاى منداڵ.
٢. كەمو كوڕى لە شێوازى دەربڕينى زمانى و خێراييەكى گونجاو بۆ قسەكردن.
٣. دەركردنى هەندێك دەنگ كە شوێنى دروستبوونى خۆى نييە، وەك ئەو جۆرە منگييەى كە لە كاتى قسەكردندا ڕوو دەدات، چونكە ئەو هەوايەى كە دەبێت لە دەمەوە دەرچێت لە لووتەوە دەردەچێت.
٤. كەمووكوڕى لە دەرككردنى واتاى دەنگەكان.
٥. كەمووكوڕى لە پەيوەندييە زمانييەكان.

### گرنگترين خەوشى قسەكردن و زمان ئەمانەن

**١. درەنگ زمان گرتن (تاخر الكلام):**

يەكەم وشە لەلاى منداڵێكى ئاسايى لەكۆتايى ساڵى يەكەمى تەمەنيدا دەردەكەوێت، بە لە بەرچاوگرتنى بارودۆخى تاكايەتى لە نێوان منداڵان، دەشێت هەندێك منداڵ لە تەمەنى نۆ مانگيدا وشە

بورکێنێتو هەندێکی دیکەیان دوا بکەوێت بۆ تەمەنی هەژدە مانگی، بەڵام ئەگەر لەم تەمەنە تێپەڕیو زیاد دواکەوت جێی تێڕوانینەو پێویستە بە چارەسەرکردن دەکاتو دەبێت هۆکارەکانی دواکەوتنی بزانرێتو دەست بە چارەسەرکردنی بکرێت.

ئەو منداڵانەی کە درەنگ زمان دەگرن ئەوەیان لێ تێبنی دەکرێت کە زمانێکی تایبەت بەکار دەهێنن کە وشەکانیان هیچ واتایەکی زمانی نابەخشێت، چونکە وشەکانیان بە پلەیەك چوونەتە ناویەکەوە بیستەر ناتوانێت لێکیان بکاتەوە یان لە واتایان بگات. هۆکارەکانی درەنگ زمان گرتن دەگەڕێتەوە بۆ کەمی توانای ئەقڵو بوونی خەوش لە ئامێری بیستنو یان تووشی نەخشیەك بوو بێت، یان لە کاتی لە دایکبووندا تووشی نەخشیەی بووبێت، یاخود تووشی نەخۆشی (سورێژە) بوو بێت، هەروەها ئەو هۆکارە ئەقڵییانەی کە پەیوەندن بە تووشبوونی بنکەی قسەکردنی مێشك بە نەخۆشی.

**٢. تەتەڵەکردن (التأتأه):**

ئەمیش خەوشێکە لە قسەکردندا کە منداڵ دەنگێك چەند جارێك دووبارە دەکاتەوەو دەنگێکی تر دەخاتە



سەر وشەکەو هەندێك جاریش لەبەر توانا نەبوون گۆکردن دەم دەکاتەوەو دەبێتە هۆی تێکچوونی جووڵەی هەناسەدانو هەناسە وەرگرتن، بۆیە ئەو لە منداڵ ڕەچاو دەکرێت کە بە شێوەیەکی ناڕێك هەناسو وەردەگرێتو دەداتەوەو هەناسە سوار دەبێت.

کەس تووشبوو لە ڕووی تێکچوونی دەروونییەوە بەم دیادەیەوە دەناڵێنیو توانایەکی تایبەتی دەبێت بۆ کارتێکردنو هەڵچوون (سەرزمان گرتن) خەشێکە لە خەوشەکانی زمان بەڵام ناگاتە سنووری لاڵ بوون.

هەندێك لە زانایان وادەبینن کە (سەرزمان گرتن — الحبسه) دووچۆری هەیە:

أ. سەرزمان گرتن ئەنجامی تێکچوونی دەمارە بزوێنەرەکان.

ب. سەرزمانگرتن لە ئەنجامی بێهێزی یادەوریی.

هۆکارەکانی (سەرزمان گرتن) دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری دەروونیو لەشیو کۆمەڵایەتی، کاتێك بە شێوەیەکی گشتی باسی هەوشەکانی قسەکردنمان کرد باسی ئەو هۆکارانەش دەکەین.

**چارەسەركدنی سەرزمان گرتن ( پڵتە پڵتكردن )**

چارەسەركردنی دەگەڕێتەوە بۆ دەستنیشانكردنێكی تەواوی ئەو حاڵەتەو زانینی هۆكارو نیشانەكانی، دەشێت بەم هەنگاوانە چارەسەری ئەو حاڵەتە بكرێت:

١. دڵنیابوون لە نەبوونی هۆكارێكی لەشی، كە بووبێتە هۆی ئەم حاڵەتە.

٢. لە پێش منداڵ نابێت بایەخێكی زۆر بەم حاڵەتە بدرێت، تاوەكو منداڵ هەست بە ترسو دڵەڕاوكێ نەكات.

٣. نابێت باوكو كەسانی گەورە لاسایی ئەو منداڵە بكەنەوە، چونكە لاسایكردنەوەی ڕۆڵ خۆشەویستكردنی ئەو ڕەفتارەی منداڵ دەدات بۆ وازنەهێنان.

٤. ئەو هۆكارانە پێشان منداڵ نەدرێت كە دەبێتە هۆی ممارسە كردنی ئەم جۆرە ڕەفتارانە.

٥. بەكارهێنانی ئامێری فێربوون قسەكردنو بە هێزبوونی، ئەویش بە سەرپەرشتی كردنی پسپۆران.

**٣. ئەفازیا: لە بیرچوونەوە:**



مەبەست لە (ئەفازیا) لە بیرچوونەوەی هێماكانە كە مرۆڤ بە هۆیەوە دەتوانێت لەگەڵ هاوڕەگەزەكانی خۆیدا بیروبۆچوونو هزری پێ ئاڵوگۆڕ بكات، (ئەفازیا) لە ئەنجامی لە بیرچوونەوە دروست دەبێت ئەگەر شێوەی نەخۆش بە خۆوەگرت، ئەویش جۆرێكە لە جۆرەكانی لە دەستدانی یادی (هیدی) زانا لە ڕووی ئەركی زمانییەوە پۆلێنی كردووەو بەسەر چوار جۆردا دابەشیكردووە وەك:

أ. ئەفازیای وشەیی و جووڵەیی: لەم حاڵەتەدا نەخۆش توانای ئەوەی نییە وشەكان ئامادە بكات بۆ ووتنی و نووسین.

ب. ئەفازیای هەستی یان تێگەیشتن: لەم حاڵەتەدا نەخۆش توانای ئەوەی نییە واتای وشەكان بگات، چونكە ئەو نەخۆشە ناتوانێت مانای دەنگەكە وەرگێڕێت، بۆیە لە كاتی قسەكردندا دەنگێك بە دەنگێكی دیكە دەگۆڕێتەوە، بۆ نموونە دەنگی (ب) دەكات بە (غ) چونكە لەوانەیە تووشی تێكچوونی توانای درككردنی بیستن بێت.

ج. ئەفازیای ڕێزمانی: لەم حاڵەتەدا نەخۆش توانای ئەوەی نییە بتوانێت ڕستەیەكی ڕێزمانی دەربڕێت، واتا ناتوانێت یاساكنی ڕێزمانی زمان پیادە بكات.

د. ئەفازیای واتایی: لەم حاڵەتەدا نەخۆش ناتوانێت لەواتای دەستەواژەکان بگات کە لە ڕستەیەکی تەواودا دێت، بۆ نموونە ئەگەر نەخۆشێك گوێ بیستی یەکێك بوو قسەی دەکرد ناتوانێت لە مەبەستی تێبگات، ئەگەر توانای ئەوەی هەبێت لە وشەکان بگات، دەبێت وشەکان بە تەنیا بێت (لێرەشدا مانای وایە پێکەوە بەستنی وشەکان بۆ بەخشینی واتای گشتی نامێنێت).

**٤. لاڵە پەتە (اللجلجة)، زمان قورسی:**

مەبەست گرژبوونەوەیەکی کاتییە کە سەر شێوەی وەستاندێك دەبێت لەسەر قسەکردن و پاشان تەقینەوەیەکی یان جوولەو تەزووپێدا هاتنی دووبارەوە بوو، ئەو کەسەی کە تووشی ئەم نەخۆششیە بووە توانا و هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ دەربڕینی قسە، هەروەها ئەوەش لە ڕوویدا دەردەکەوێت کە پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر هەردوو لێوو ڕشتەی ئەندمەکانی ئاخافتنی، بەم جۆرە زمانگیر دەبێت.



**چارەسەرکردنی زمان قورسی ( لاڵە پەتە )**

پاش توێژینەوەیەکی زۆری ئەم دیاردەیە لە ڕووی لەش و هۆش (عقلی) و دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە، گەیشتنە ئەوەی چەند ڕێگە چارەیەك بۆ زمان قورسی بدۆزنەوە، وەك:

١. چارەسەرکردنی پزیشکی: چارەسەرکردنی ئەو هۆکارە ئەندامییانەی کە بوونەتە هۆی دەرکەوتنی ئەم دیارەدەیە لەلای نەخۆش، ئەم چارەسەرکردنەش لە نەخۆشخانەو دیدەنگە پزیشکییەکاندا دەکرێت.

٢. چاەرسەرکردنی دەروونی: ئەم چارەسەرکردنە لەو حاڵەتانەدا دەبێت کە نەخۆشییەکە بە هۆی تێکچوونی ئەندامەکانی لەشەوە نەبێت، ئەم چارەسەرکردنەش شێوازو ڕێگای جۆربەجۆری هەیە وەك:

**- ڕێگای یاریکردن:**

لە ڕێگای یاریکردنەوە دەشێت هەست بە سەربەستییەکی تەواو بکات، یان بە هۆی یاریکردنەوە ئەو هەستەپەنگخواردووەی دەربڕێت کە دەبێتە هۆی لە ناوبردنی نیگەرانی و ترس و دڵەڕاوکێی، هەروەها تێکەڵبوونی بە یاری بە کۆمەڵ لەگەڵ هاوڕێکانی ئەوەی

لەلا دروست دەکات کە توانای هەیە مامەڵە لەگەڵکۆمەڵدا بکات.

**- شیکاری وێنەیی:**

دەشێت بە هۆی شیکاری وشێنەییەوە پوختەی کۆمەڵێك زانیاری گرنگ سەبارەت بە کەسایەتی منداڵ و پەیوەندی بە دایك و باوك و هاوڕێیەکانیەوە بەدەست بهێنین، ئەم ڕێگایەش بە نشیاندانی وێنە ئەنجام دەدرێن بەوەی کە هەندێك هەڵوێست و شتی جۆراوجۆر نیشان منداڵە تووشبووەکە دەدرێت ئەویش دەست دەکات بە لێکدانەوەی ئەوەی کە تێیدایە.

**- تاقیکرنەوەکانی کەسایەتی:**

لێکۆڵەر بە هۆیەوە دەتوانێت هەندێك لایەنی پەیوەست بە کەسایەتی ئەو کەسە دەرخات کە تووشی زمانگرتن بووە، لەو تاقیکردنەوانەش تاقیکردنەوەی (روودجرز) و تاقیکردنەوەی لە بابەت گەیشتن.

- مەبەست لە (ایحاء - نیگا) ئاراستەکردنی نەخۆشە بۆ چەشنە ڕەفتارێك یان شتێك یان هەڵوێستێك بۆ دانای سنورێك بۆ ترسی ئەو منداڵە کە لە ئەنجامی خەوشەکانی قسەکردنەوە پەیدا بووە، هەروەها ئامانجی (نیگا) گۆڕێنی تێروانینی تووشبووە بۆ خۆی، بەڵام مەبەست لە (قەناعت



پێهێنان) پێشچاو خستنی ڕوابۆچوون و بیرێکە بۆ کەسی تووشبووە، بە پێی بنەمایەکی رازیکەر کە ببێتە هۆی بەکارخستنی عەقڵی و گفتوگۆکردن لەگەڵ تووشبوودا و دوورخستنەوەی لە سەرچاوەی دژواری قسەرکردن و ئەوەی پەیوەندی بە پەشۆکانەوە هەیە.

**- هاوکردنەوە:**

لەسەر بنەمای مەشقپێکردنی نەخۆش بە شێوەیەکی لەسەرخۆو بە شێنەیی بۆ خاوکردنەوەی ماسوولکەکانی، چونکە ئەمەش بەشێنەیی دەبێتە هۆی پوکانەوەی شوێنەواری چالاکیەکانی هۆش (ذهن) و پەشێوەییە هەڵچوونیەکان.

– گفتوگۆکردن لەسەر کێشەی تووشبوون بە (زمان قورسی– لاڵەپەتە) لەگەڵ ماڵ و قوتابخانەدا:

وا دەرکەوتووە کە دروستبوونی پەشێوییە دەرونییەکان لە لای تووشبوو پەیوەندی بە ماڵەوە هەبێت، لێرەدا ئەوە بۆ لێکۆڵەران دەرکەوت کە زۆر گرنگە ڕێنمایی دەروونی پێشکەش بە تووشبوو بکرێت، هەروەها ڕێنمایی بە هەموو ئەو کەسانەش بدرێت کە لە دوور یان نزیکەوە پەیوەندیان بە تووشبووەکەوە هەیە، ئەویش لە دایك و باوك و خێزانەوە دەست پێ دەکات تا دەگاتە کۆمەڵگا کە

لە قوتابخانەدا خۆی دەنوێنێت.

**٣. ڕێگای چارەسەرکردن بە ئاخافتن:**

لەم ڕووەوە ڕێگای جۆربەجۆر بەکارهێنراوە، وەك:

– خاووبوونەوە ئاخاوتن سەر لە نوێ فێکردنی ئاخاوتن:

ئامانجیش لەم ڕێگای ڕزگاربوونە لە هۆکارەکانی پەشێوییەکانی زمان گرانی لە کاتی قسەکردندا.

– مەشقکردن لەسەر ئاخافتنی ترپەیی: لێرەدا هەندێك شارەزایی تێیدا بەکار دەهێنرێت یان هەندێك بزوتنەو جووڵە دەخرێتە سەر مەشقکردن لەسەر ئاخافتن، وەك بەکارهێنانی لێدانی زەوی بە پێ یان فیکەلێدان، ئەم کارانەش یارمەتی تووشبوو دەدات بۆ لە بیربردنەوەی کێشەکەی و بەستنەوەی ترپەیەکی دیاریکراو بە دەنگێکی دیاریکراوەوە.

– ڕێگای دەربڕین بە جوینەوە (المضغ):

داوا لە تووشبوو دەکرێت کەوا خەیاڵ بکات کە دەستی کرد بە قسەکردن، قووتیان بدات، بەم جۆرە سەرەنجی منداڵە تووشبووکە لە بەکارهێنانە هەڵەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ پرۆسیسی جووینەوە (یان قووتدان) ئەمیش دەبێتە



هۆی کەمکردنەوەی ترس و نیگەرانیەکەی لە ئەنجامی دەربڕینی هەندێك وشەی تایبەتیدا.

– بەرنامەی چارەسەرکردنی گشتی:

مەبەست لە بەکارهێنانی ژمارەیەك شێوازە پێکەوە بۆ چارەسەرکردنی لاڵەپەتێی، کەکە ئەویش لە نێوان چارەسەرکردنی دەروونی و ئاخافتنیدا کۆدەبێتەوە، ئەگەر ئەم دوو چارەسەرکردنە پێکەوە بە ڕێکوپێکی بەکارهێنرا ڕەنگە مەبەستێکی گشتی بێتە دی ئەویش بڵاوکردنەوەی گیانی سرەوتن و ئارامییە لە دەروونی تووشبوو بۆ چاککردنی ئاخافتن و ڕاستکردنەوەی.

**٥. تەتەڵەکردن (التأتأة):**

ئەم حاڵەتە زیاتر لە نێوان ساڵانی (٥-٧) تێبینی دەکرێت، ئەمیش کەموکوڕی دەربڕینە کە زیاتر لەلای منداڵ سەرهەڵدەدات، زۆر جاریش بە عەرەبی پێ دەوترێت (لکنه السین) واتا بە قورسی دەربڕینی (س)، لەم تەمەنەدا گۆڕان بەسەر دداندا دێت، واتا ددان دەکەوێت و ددانی نوێ دەڕوێت، هەندێك منداڵ لە پاش ددان دەرهێنانی نوێ لەو دەربڕینە قورسەی (س) ڕزگاری دەبێت بەڵام هەندێکی دی ڕزگاری نابێت، ئەگەر

چارەسەرکردنێکی دەروونی و ئاخاوتنی بۆ نەکرێت، ئەم قورسیی دەربڕینەش لە کۆکردنی دەنگی (س)دا ڕوودەدەکات کە بە دەنگەکانی وەك (ثاء و شین و دال)ی دەگۆڕێتەوە، هۆکاری ئەم زمان قورسیەش دەگەڕێتەوە بۆ جووت نەبوون ددانەکان و هۆکاری لاسایکردنەوە، دەشێت یەکێك لە یەکەکانی خێزانەکەی تووشی ئەم (پسەپس التأتأە) کردنە بووبێت و ئەو منداڵەش ئارەزووی لاسایکردنەوەی بکات، هەروەها بەرکەوتنی یەکێك لە بنکەکانی مێشك دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە.

**- چارەسەکردنی ( تەتەڵەکردن ):**

ئەم دیاردەیەش بەوە چارەسەر دەکرێت کە دەبێت پشکنینێکی پزشکی بۆ بکرێت بۆ دڵنیابوون لە ساغ و سەلامی ددانەکانی و جووتبوونیان، هەورەها زانینی هۆکارە ئەندامییەکان کە بوونە هۆی ئەو ڕووداوە.

لە ژێر تیشك و ڕووناکی ئەو هۆکارانە چارەسەرکردنێکی سەرکەوتوو بۆ ئەم دیاردەیە بەکاردێت لەو شێوازانەش کە بۆی بەکاردێت شێوازی چارەسەرکردنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕێنمایی کردنە، هەورەها دەشێت ڕێگای چارەسەرکردنی ئاخافتنیش



بەکار بهێنرێت، ئەویش بۆ مەشقکردنی ئەو منداڵە تووشبووەیە بۆ ئەوەی بتوانێت کۆنترۆڵ جوولانەوەی زمانی بکات لە هەڵوێستە جۆربەجۆرەکانی ناو و دەرەوەی دەمدا، هەروەها مەشقپێکردنی لەسەر دەربڕینی دەنگی (س) و لە کاتی مەشقپێکردنی لەسەر دەربڕێنی دەنگ ئاوێنەیەك لە بەردەمی دادەنرێت بۆ بەراوردکردنی ئەو جوولانەی کە خۆی پێی هەڵدەستێت و ئەوەی کە چارەسەرکەرەکە پێی هەڵدەستێت، بەم شێوەیە دەمێنێتەوە تاوەکو گونجانێك لە نێوان توانای جووڵەیی و توانای بینین دێتە دی.

**دووەم: هۆکاری خەوشەکانی ئاخافتن و زمان**

پرۆسیسی گەڕان بە دوای خەوشتەکانی ئاخافتن و زمان شتێ بە خۆوە دەگرێت ئەویش ئەوەیە کە ناتوانرێت زۆر بە وردیەکی بابەتیانە هۆکارەکان دەستنیشان بکرێت، چونکە لەگەڵ دیاردە جۆربەجۆرەکانی دیکەدا وێڵ ناچن، چونکە هەر دیاردەیەك هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە و هەر چەندە لەگەڵ هۆکاری دیاردەکانی دیکەشدا تێکچڕژابن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی گشتی هەڵدەستێت بە چوارچێوەکردنی ئەو هۆکارانەو لە سێ هۆکاردا دیاری دەکەین، وەك:

**أ. هۆکارە ئەندامییەکان:**

لە ئەنجامی نەخۆشییەك لە نەخۆشیەکان یەکێك لە ئەندامەکانی بەرهەمهێنانی ئاخافتن زیانی لێ دەکەوێت، وەك زمان و قورگ و ددان و لووت، یان هەر ناتەواویەك لە کردەو فەرمانی ئەندامێك لە دەمارەکان دەبێتە ڕێگر لە بەردەم پێکەوە نەجولانی ئەندامەکانی بەرهەمهێنانی ئاخافتن، هەروەها مێشك تووشی هەر بەرکەوتەیەك بێت دەبێتە هۆی دواکەوتنی پرۆسیسی گەشەکردنی ئاخافتن و گۆڕانی دەنگ و شێوازی دەربڕین، ئەویش لە ئەنجامی ئەو نەخۆشیانەوە دێت کە تووشی کۆ ئەندامی دەمار، یان تووشی کوێرە ڕژێنەکان (الغدد الصماء) دبێت.

**ب. هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان:**

هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ هۆکارە دەروونییەکان تێکەڵ دەبێت و ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە دروستکردنی نەخۆشییەکانی ئاخافتن و زمان، لەو هۆکارانەش وەك:

- **پێشەنگی خراپ (القدوة السیئة):**

کارتێکردنی ئەمەش کاتێك دەردەکەوێت کە یەکێك لە ئەندامانی ئەو خێزانە لە پێش منداڵێکدا هەندێك وشە زمانە کە بە شێوەیەکی هەڵە گۆ بکات و ئەو منداڵەش هەڵدەستێت بە چاولێکردن و لاساییکردنەوەی ئەو



وشانەی کە گوێی لێ دەبێت.

- تێڕوانینی کۆمەڵگا بۆ ئەو منداڵانەی کە تەنها دەستی چەپ بەکاردێنن لە خواردن و خواردنەوەو نووسین و ناچارکردنی بۆ بەکارهێنانی دەستی ڕاست لە جێگای دەستی چەپ.
- زیاد لە پێویست ئارەزووی پێ لەسەر داگرت و فێرە ڕەوشتکردن و کۆمەڵێنەوەی بەردەوام لەلایەن تاکەکانی کۆمەڵگاوە بۆ سەر منداڵ لە مەسەلەی پاك و خاوێنی و خۆراك و زۆرسەرزەنشتکردنی منداڵ.
- نەگونجانی منداڵ لەگەڵ ئەو ژینگەیەی کە تێدایە، لە دەستدانی پەیوەندی بە هەڵوێستی ڕاستەوخۆ یان پێشبینیلێکراو، کە ئەم هۆکارەش دەبێتە هۆی دابڕانی منداڵ لە ژینگەکەی و کەسایەتێکی توڕەی لێ دەربچێت، لە کاتی ئاخافتندا ڕێگرییەکی بۆ دروست بکات.
- نازپێدانی زیاد لە پێویست بۆ منداڵ یان پشتگوێ خستنێکی بە ئەنقەست.

## هۆكاره دەروونییەكان

زانایان خەوشەكانی زمان‌و قسەركردن دەگەڕێننەوە بۆ بنەمای دەروونی، ئەو ئاڵۆزی‌و توندوتیژی‌و هەڵچوونانەی لەلای منداڵدا دەردەكەوێت، هەندێك جار دەبێتە هۆی كاردانەوەی وەك ئێرەیی‌و ئارەزووی خۆ دەرخستن لە پێش چاوی‌خەڵكی، دەشێت هۆكارە دەروونییەكان لەم خاڵانەدا كۆبكەینەوە:

- گرژیی هەڵچوون‌و دەمارگیری.
- ئارەزووی منداڵ بۆ ئەوەی ببێتە جێگەی سەرنجی خەڵكی.
- ئەگەری وروژاندنی هەستی منداڵ‌و زیاتر نیگەران بوون.
- چاودێری كردنێكی زۆر لەلایەن دایك‌و باوكەوە بۆ منداڵ،تاكو دەگاتە پلەی نازونوزكردن.
- هەستكردن بە نائومێدی‌و بێ بەشكبوون.
- زۆر سەرزەنشتكردن‌و سزادان.
- زێدە خۆشەویستەیەك كە دەشێت ئەو منداڵە لە منداڵێكی تر زیاتر بە دەستی بهێنێت.
- ناكۆكی لە نێو خێزاندا.
- كەمیی سۆزو خۆشەویستی یەكێك لە دایكان‌و باوكان.



- بوارپێنەدانی منداڵ بۆ قسەكردن‌و پێ بڕینی قسەكانی بە شێوەیەكی زۆر توندوتیژ.

ئەمانە‌و هەستكردنی منداڵ بە پاشماوە خراپەكانی دەروونی وای لێ دەكات بەردەوام نیگەران‌و ترساو بێت‌و ئەم ڕقەبەرایەتیە دەروونیەش كاردانەوەی دەبێت لەسەر توانای قسەكردن‌و بەكارهێنانی زمان.

### سێیەم: چارەسەركردنی خەوشەكانی قسەكردن‌و زمان:

لە میانەی دەرخستنەكانی پێشترمان جۆرەكانی خەوشی قسەكردن‌و زمانمان ناسی، كە بە هۆی هەندێك شێوازەوە دەشێت چارەسەری ئەو خەوشانە بكرێت، لێرەدا ئێمە جەخت لەسەر ئەوە دەكەینەوە كە یەكەم هەنگاو لە چارەسەركردن، زانینی هۆكارەكانی خەوشی قسەكردن‌و زمانە، چونكە ئەمە بە شێوەیەكی كاریگەر دەبێتە یارمەتی دەرمان لە دەستنیشانكردنی ئەو بارودۆخەی نەخۆش‌و ئاسانكردنی ڕێگای چارەسەركردن.

دەشێت شێوازەكانیش لەم خاڵانەدا كۆ بكەینەوە:

١. دەستنیشانكردن‌و چارەسەری پزیشكی :پاش ئەنجامدانی پرۆسیسی دەستنیشانكردنی نەخۆشییەكە، ئەگەر دەركەوت هۆكانی ئەو نەخۆشییە دەگەڕێتەوە بۆ

هۆکاری جەستەیی (عضوي) ئەوا دەبێت وەك سەرەتایەك بۆ ئەو چارەسەرکردنە بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە سەرکردنی پزیشکی.

٢. چارەسەرکردنی دەروونی – کۆمەڵایەتی: پاش پرۆسیسی دەستنیشانکردن دەرکەوت هۆیەکان دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری دەروونی یان کۆمەڵایەتی، ئەوا ئێمە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەم جۆرە چارەسەرکردنانە، کە ئەویش چەند ڕێگایەکی دەروونیو پەروەردەییو کۆمەڵایەتیو ڕێنماییو پاراستنو چارەسەرکردنە، وەك:

– شێوازی ڕێنمایی دەروونی یەك یەکی.
– شێوازی ڕێنمایی خێزانیی.
– شێوازی ڕۆشنبیرکردنی کۆمەڵایەتی.

٣. چارەسەرکردن بە ئاخافتن: بریتییە لە کۆمەڵێك مەشقکردن بە تووشبوو (نەخۆش) بە دەربڕینی پیتو وشەو ڕستەکان بە شێوازی یەك لە دوای یەك (تدريجي).

٤. ڕێبازی چارەسەرکردنی گشتگیری: لێرەدا لە ڕێگایەك زیاتری تێدا بەکاردێت، چونکە دەشێت لە بەکارهێنانی یەك ڕێگای چارەسەرکردن هەندێك لایەنی نێگەتیڤی لێ بکەوێتەوە، لە ڕێگای چارەسەرکردنی تەتەڵەکردن (اللجلجة)دا ئاماژەمان بۆ ئەم شێوازە کرد.



**چوارەم: ڕۆڵی خێزانو قوتابخانەو کۆمەڵگا لە چارەسەرکردندا:**

١. **ڕۆڵی خێزان:** خێزان ڕۆڵێکی گەورەو کاریگەری هەیە چونکە منداڵ سەرەتای ژیانی لەگەڵ خێزاندا دەست پێ دەکات، لەگەڵ تاکەکانی خێزانەکەیدا دەست بە مامەڵەکردن دەکاتو هەموو ڕەوشتو دابو نەریتو زمانەکانی لێ وەردەگرێت.

دەشێت بڕوانینە ڕۆڵی خێزان کە بە دوو ئاراستەی بنەڕەتی تێدەپەڕێت ئەویش:

أ. **ڕۆڵی پاراستن:**

ئەم ڕۆڵەش لە کاری خێزانەوە دەردەکەوێت بە داخستنی هەموو ئەو کون و کەلەبەرانەی کە دەشێ ببێنە هۆی بڵاوبوونەوەی هەندێك کاروکردەوەی نالەبار بۆ ئەو منداڵە.

ئەو کارانەی کە خێزان پێی هەڵدەسێت بۆ پاراستنی منداڵەکەیو سانسۆر دەخاتە سەریان ئەمانەن:

– دورکەوتنەوە لە ناکۆکی نێو خێزانی لە پێش چاوی منداڵ.
– دورکەوتنەوە لە سوکایەتیو گاڵتەپێکردنی منداڵ.

- دورکەوتنە لە خۆشەویستن و نازپێدانی منداڵێکی دیاری کراوی خێزانەکەت لەسەر حیسای منداڵێکی تر.
- دورکەوتنەوە لە نازپێدانی زۆر بۆ منداڵ یان نواندنی توندوتیژی.
- بەکارنەهێنانی وشەی نەشیاو و نەگونجاو لە پێش منداڵ.
- چارەسەرنەکردنی دیاردەی زمان قورسیی (الاعسر) بە ڕێگایەك کە جێی سەرنج ڕاکێشان نەبێت.

**ب. ڕۆڵی چارەسەرکردن:**

ئەم ڕۆڵەش لە ئەنجامی بە دواداچوون و چاودێریکردنی کردنی خێزان بۆ منداڵەکانیان دەردەکەوێت لەگەڵ ڕاستەوخۆ هەستانیان بە چارەسەرکردنێکی تەواو لە حاڵەتی دەرکەوتنی هەر خەوشێك لە خەوشەکانی قسەکردن و زمانی منداڵەکەیان هەروەها کەڵك وەرگرتن لە ئامۆژگاری پسپۆرانیش.

٢. ڕۆڵی قوتابخانە: ڕۆڵی قوتابخانەش لە ڕۆڵی خێزان جیاوازتر نییە، پێویستە مامۆستایان بە دواداچوونیان هەبێت بۆ قوتابیەکانیان و بە



بەردەوامی چاوەدێریان بکەن بۆ چارەسەرکردنی هەر تێبینییەك کە دەیبینن، هەروەها لەسەریان پێویستە دوورکەونەوە لە سووکایەتی و گاڵتەپێکردن و ئابرووبردنی منداڵ.

هەروەها پێویستە مامۆستا بایەخ بەو منداڵانە بدات کە لە ڕووی بیستنەوە لاوازن و یارمەتیان بدات بۆ باش گوێ گرتن، بەهەمان شێوە سەبارەت بەو منداڵانەش کە لە ڕووی بینینەوە لاوازن و هەروەها هەر منداڵێك کە لە ڕووی دەربڕینەوە کێشەی هەیە و ناتوانێت بدوێت، هەروەها دەشێ قوتابخانە ئەم کارو کردەوانەی لەگەڵ قوتابیانیدا پێڕەو بکات:

- بەشداری کردنی منداڵان لە لیژنەی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان.
- بەشداری کردنی منداڵان بۆ قسەکردن لە ئیزگەو ڕادیۆی قوتابخانە.
- بەشداری کردنیان لە گەشت و خێوەتگادیدەوانیەکان (المخیمات الکشفیە).
- بەکارهێنانی ڕێنمایی دەروونی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی.

٣. ڕۆڵی کۆمەڵگا:

ئەم ڕۆڵەش لەم خاڵانەدا دەردەکەوێت:

– ڕەخساندنی دەرفەت بۆ منداڵان تا بەشداری ئاهەنگە گشتییەکان بکەن.

– ڕەخساندنی دەرفەت بۆ منداڵان بۆ قسەکردن لە چالاکییەکانی وتار خوێندنەوەدا.

– دابینکردنی چارەسەری پزیشکی و دەروونی و ئاخافتن، بەسەرپەرشتی پسپۆڕەکانی ئەو بوارانە.

– ئامادەکردنی بنکەی تەندروستی.

## پێنجەم: زمانی کەڕ

لە ڕووی زمانەوە ئەو کەسانەی کە کەڕن وادادەنرێن دابڕاوبن لە کەسانی تری نێو کۆمەڵگا، بەڵام ئەم دابڕانەش کارناکاتە سەر توانای مێشکییان یان توانای فێربوونیان، هەر چەندە ئەو کەسانەی کە کەڕن لە نیعمەت و خۆشی بیستن بێبەشی بوونە، لەگەڵ ئەوەشدا بە گوێرەی توانا هەوڵی ئەوە دەدەن بەشی ڕۆشنبیری خۆیان لەو ناوەندی تێیدا دەژێن وەرگرن، هەروەها زیرەکی ئەم کۆمەڵە هیچ کەم و کورتی تێیدا نییە تەنها دەربڕینی زارەکی نەبێت کە پێویستە بۆ پەرەپێدانی زمانی



ناوخۆیی، بۆیە ئەو ڕێگایەی کە کەڕ دەیگرێتەبەر بۆ قسەکردن ڕێگایەکە بە هۆی جوڵەوە[1] دەبێت.

زانایان حاڵەتی کەڕییان بۆ سێ ئاست پۆلێن کردووە، کە ئەمانەن:

١. کەڕیی تەواو.

٢. کەڕیی مام ناوەند.

٣. کەڕیی سادە.

هەر یەك لەم ئاستانە نرخی تایبەتی خۆی هەیە لە ڕووی قەوارەی کێشەکە و هۆکارو چارەسەرکردنی.

## هۆکارەکانی کەڕبوون

زانایان هۆکاری کەڕبوون دابەش دەکەنە سەر سێ بەشەوە:

١. کەڕیی بۆماوە (الوراثة).

٢. ئەو کەڕییەی لە ئەنجامی نەخۆشییەکەوە کە تووشی ئامێری بیستن و مێشك دەبێت.

٣. ئەو کەڕییەی کە هۆکارەکانی نادیارن و تا ئێستا نازانرێت.

[1] د. حنفي بن عيسى – مرجع سابق، ص ٢٨٩.

**کەڕیی لە ڕشتەی بیستندا ( جهاز السمعي )**

پێشتر ئەوەمان تێبی کرد کە کەریی سێ ئاستە لە نێوان کەڕیی تەواو یان کەڕیی مام ناوەندی یان کەڕیی سادە، ئەوەیشی ئەم ئاستانەی دیاری کردووە جۆری توشبونی ئامێری بیستنو شوێنی تووشبوونەکەیە، وەك:

**- کەڕیی سادە:**

ئەم جۆرە کەڕییە دەکەوێتە گوێچکەی دەرەوە لە ئەنجامی زۆر دەردانی مادەی مۆمییەوە ڕوودەدات، ئەویش دەبێتە هۆی گرتنی کەناڵی بیستن، بۆ چارەسەرکردنی پێویستە بە بەردەوام منداڵ مەشق بدرێت بۆ لابردنو پاککردنەوەی ئەوە مادەیە لەناو گوێدا.

**- کەڕیی مام ناوەندی:**

ئەم جۆرە کەڕییە لە گوێچکەی ناوەڕاستە ڕوودەدات، بە هۆی سەرماو هەڵامەتێکی بە هێزەوە پاڵە پەستۆیەکی زۆر دروست دەبێتو کار دەکاتە سەر پەردەی گوێو کار دەکاتە سەر نەرمیو جیڕیو توانای ئەو پەردەیەو بۆ لەرینەوەو وەرگرتنی دەنگەکان، بەم جۆرە بەشێك لە ئەرکی بیستن وون دەکات.



**- کەڕیی توندوتیژ:**

کەڕیی ناوەوەی گوێچکە کە شوێنی دەمارەکانی بیستنە، ئەگەر ئەم دەمارانە تووشی زەرەرو بوون توانای ئەوەیان نەبوو دەنگ بۆ ناو ژوورەکانی شلەمەنی بیستن بگوێزنەوە، ئەوا دەنگ ناگات بە بنکەکانی وەڵامدانەوەی مێشك، بۆیە کەڕی توندوتیژی لێ دەکەوێتەوە.

**چارەسەرکردنی گوێ قورسەکان:**

ڕێگاو شێوازی جۆربەجۆری بۆ بەکاردێت:

- مەشقدانی گوێ قورسەکان بۆ جیاکردنەوی ئەو دەنگانەی کە دەگاتە گوێیان، وەك دەنگەکانی ئۆتۆمبیلو مرۆڤ و بروسکەو.. هتد.
- لەسەر چرپەو بە ئەسپایی قسەکردن مەشق بدرێت بۆ ئەوەی ڕابێت لەسەر تێبینی کردنی دەنگی ورد.
- گەیاندنی دەنگەکان لە چەند دووریەکی دیاری کراوە.
- مەشق لەسەر بە ئاگابوونی بیستن بدرێت.
- تێبینی جووڵەی لێوەکان بکرێت.

بەڵام ئەو منداڵەی کە بە کەڕییەکی تەواو لە دایك دەبێت مەحاڵە فێری زمانی بیستراو بکرێت، لێرەدا پێویستە لەسەر زمانێکی گونجاو بە پێی ئەو حاڵەتەی تێیدا دەژێت

مەشق بدرێت، گونجاوترین زمانیش زمانی هێما کردنە، کە دەتوانێت بە چەند ڕێگایەك وەری بگرێت، دەشێت لە کۆمەڵگای کەڕولاڵدا وەری بگرێت، کە یانەو قوتابخانەی تایبەتیان بۆ دروستکراوە، یان لە ڕێگای خێزانەوە بە تایبەتی ئەو خێزانانەی کە وەك بۆماوەیی منداڵی کەڕیان هەیە، یان لە ڕێگای ئەو پسپۆڕانەوە کە یارمەتی منداڵی کەڕ دەدەن بۆ ئەوەی فێری زمانی هێماکردن ببێت.

شایانی باسکردنە کە ئەو هێمایانەی کە کەڕ بەکاری دێنێت بەسەر دوو بەشدا دابەش دەبێت:

– هێمای وەسفی: ئەو هێما دەستییە خوییە کە لەلایەن کەڕەوە ئەنجام دەدرێت لە پێناوی وەسفکردنی هزرێکی دیاری کراو کە دەیەوێت ڕاڤەو لێکدانەوەی بۆ بکات، وەك بەرزکردنەوەی هەردوو دەست بە مانای (درێژ) یان کردنەوەی هەردوو باڵ بە مەبەستی زۆر.

– هێمای نا وەسفی: ئەو جۆرە هێما تایبەتیەیە کە وەك زمانێك وایە کە لە نێوان کەڕاندا ئاڵوگۆڕی پێدەکرێت، بۆ نموونە هێماکردن بۆ سەرەوە مانای شتێکی باش دەگەیەنێت.

ئەمەو، شارەزایانی ئەم بوارە ئەلف و بێیەکی هێماییان داناوە کە جووڵەی دەست و پەنجە ڕۆڵێکی گەورە دەبینن



لە دیاریکردنی وشەکانی ئەم ئەلف و بێیە، وێنە ژمارە (٥) ئەم ئەلف و بێیە ڕوون دەکاتەوە.



**ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد پاش کۆنفرانسی ئازادی بەچاپی گەیاندوون جگە لە گۆڤاری گزنگ کە بەردەوام مانگانە دەردەچێت**

| ز | ناوی کتێب | بابەت | نووسەر | وەرگێڕ | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٠٨ | خوێندنەوەی چەند دەقێکی ئەدەبی و فیکری | خوێندنەوە | سامان محەمەد | | ٢٠١٠ |
| ١٠٩ | هەرمێیەکانی فیرعەون | شیعر | ئەحمەدی مەلا | | ٢٠١٠ |
| ١١٠ | تەونێك لە شیعر و وشە | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | مەحمود نەجمەدین | | ٢٠١١ |
| ١١١ | ١ ١ ١ نامەی سۆزداری | تێکستی دڵداری | کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: حەمە سەعید زەنگنە | | ٢٠١١ |
| ١١٢ | دانای کوێخا شەوکەت | ڕۆمان | موعتەسەم ساڵەیی | | ٢٠١١ |
| ١١٣ | سەمای روح | کورتە چیرۆك | نەوزاد یوسف کاکەیی | | ٢٠١١ |
| ١١٤ | سلێکوك هۆکلێر عاجباتیی هەشتەم | ڕۆمان | عەبدوڵلا سەڕاج | | ٢٠١١ |
| ١١٥ | خەزان و شنەی بەیان | شیعر | غازی ڕەشید زەنگنە | | ٢٠١١ |
| ١١٦ | بزووتنەوەی ڕوانگە و شاعیرانی حەفتا و هەشتاکانی هەولێر | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | د.هیمدادی حوسێن | | ٢٠١١ |
| ١١٧ | ئاوابوونی جەستە لە سەفەری دڵدا | شیعر | ستار ئەحمەد عەبدولڕەحمان | | ٢٠١١ |
| ١١٨ | دەرگاکان | کۆچیرۆك | خالید مەجید فەتحوڵلا | | ٢٠١١ |
| ١١٩ | تەنیا لەبەر مەعاشەکەیە | کورتیلە چیرۆك | بەکر دەروێش | | ٢٠١١ |
| ١٢٠ | گەشەکردنی زمانی منداڵ | زمانی منداڵ | | و: د.ئازاد ئەمین باخەوان و ناصح محمد فاتح | |



